ناوی کتێب : ئێمەو ئەوان ناکۆکیەکانمان لەسەر چین؟

- کۆمەڵێك وتار —

نوسینی : نەوشیروان مستەفا

تیراژ : ٢٠٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ١٢٥٠ ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

چاپ : چاپخانەی زەرگەتە/سلێمانی – چاپی چوارەم

نرخ : [illegible] دینار

«ئەم کتێبە بەشێکە لەو نوسین و وتارانەی کە نەوشیروان مستەفا ئەمین لە ماوەیساڵی ٢٠٠٧ – ٢٠٠٨ نوسیویەتی و لە رۆژنامەی «رۆژنامە» و سایتی «سبەی»دا بڵاوبونەتەوە.»

# پێرست

# ئەم پارلەمانەی ئێمە: له خەمی کێ دان جگە لەخۆیان؟ ★

یەکەم پارلەمانی کوردستان کە ئەبو دوای ٦ مانگ بەپێی رێککەوتنی هەردو حیزبی گەورە و، دوای ٤ ساڵ بەپێی ئەو قانونەی رێکی خست بو، دوبارە بێتەوە، بەڵام بە هۆی نەبونی ویستی سیاسی لای سەرکردایەتی هەردو حیزب، هەڵبژاردن دوبارە نەبوەوە تا ئەمەریکا هاتەعیراق و رژێمی بەعسی روخان و، رێوشوێنی هەڵبژاردنی گشتی لە عیراق و لە کوردستانداندا.

کاتێ باسی پرۆسەی هەڵبژاردنەوەی پارلەمانی کوردستان هاتەکایەوە لە ناو خەڵکدا دو بۆچون هەبو:

یەکەمیان، داوای ئەکرد خەڵک بەگەرمی بەشداری بکا لە هەر ٣ هەڵبژاردنی کوردستاندا: ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق، ئەنجومەنی پارێزگاکان. ئەمانە وایان ئەزانی تەجروبە لە رابردو وەرگیراوە. ئەمجارەیان پارلەمان کارا و چالاک ئەبێ لە ئەنجامدانی فرمانەکانیدا.

دوەمیان، بێ هیوا بو لەم پارلەمانەش، پێی وابو کۆپیەکی ئەوەی پێشو ئەبێ و، ئەمیش کارا نابێ، ئەرکەکانی پێ جێبەجێ ناکری، چونکە بڕیار لە دەس سەرکردایەتی حیزبەکاندا ئەمێنێتەوە. لەبەر ئەوە بەشداری لە هەڵبژاردنەکاندا هیچ سودێکی راستەقینەی نابێ.

★ سایتی سبەی مانگی پێنجی ٢٠٠٧

من خۆم لە گەڵ بۆچونی یەکەم بوم، بە هیوا بوم کەهیچ نەبێ پارلەمان هەندێ لە ئەرکەکانی جێبەجێ ئەکا، بە تایبەتی:

- چاودێری بودجەی ساڵانەی هەرێم و جۆری دابەشکردن و سەرف کردنی.
- لێپرسینەوەی وەزیرەکان و کاربەدەستانی وەزارەتەکان.

بە داخەوە ئێمەمانان کە بانگەشەمان بۆ بۆچونی یەکەم کرد و، داوامان لە هەمو دەنگدەران، لە کوردستان و لە دەرەوە، کرد بە پەرۆش و گەرمیەوە بچن بۆ دەنگدان دەرکەوت بە هەڵە چوبوین، چونکە ئەمیش ئەگەر لەوی پێشو لاوازترنەبوبێ ئازاتر نەبو.

ئەگەر بەهانەی پارلەمانی پێشو هەڵگیرسانی شەڕێکی ناوخۆی خوێناوی بو کە بەوان نەئەکوژایەوە، ئەوا ئێستا یەکێتی و پارتی بە هاوپەیمانێتیەکی ستراتیجی بەرامبەر جۆری بەڕێوەبردنی کوردستان و جۆری بەشداری لە داوودەزگا ناوەندیەکانی عیراق بەسترانەوەتەوە و، حیزبە کوردیەکان و تەنانەت ڕەنگە جیاوازەکانی تورکومان و مەسیحی و فەیلی و ئیزیدی و شەبەک و کاکەیی.. لە ئیئتیلافێکی پارلەمانی و حکومەتی فراوان دا بەشدارن و، مەترسی شەڕی ناوخۆ، هیچ نەبێ لەم قۆناغەدا، لە گۆڕێ نیە. ئەبێ چی کۆسپێلە ڕێی ئەنجامدانی کارەکانیان‌دا بێ؟ ئەو کۆسپە: ئایا سەرکۆماری عیراقە؟ ئایا سەرۆکی هەرێمی کوردستانە؟ ئایا سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە؟ ئایا سەرۆکی پارلەمانە؟ ئایا سەرکردایەتی یەکێتی و پارتیە؟

## ئەندامانی بەڕێزی پارلەمان!

وا خەریکە ماوەی قانونیتان لە تەواو بون نزیک ئەبێتەوە، کاتی ئەوە هاتوە حسابێکی سەرەتاییتان لە گەڵ بکەین:

ئەگەر منەتی پەسەندنی دەستوری عیراقمان بە سەرا ئەکەن، بەبێ هیچ ئیعتیرازێ لە سەر هیچ مادە و بڕگەیەکی، بە کۆی دەنگ.. ئەوە جێگەی شانازی نەبو، چونکە ئەو دەستورە چەندین مادەی نەشیاو و قابیلی گفتوگۆی تێدا بو، کە ئەبو ئیعتیرازی لە سەر بگرن.

ئەگەر منەتی نوسینی پرۆژەی دەستوری هەرێمی کوردستانمان بە سەردا ئەکەن، ئەو دەستورە بە پێشەکیە درێژە کاڵوکرچەکەیەوە و، بە هەمو مادە باش و خراپە درێژە کۆنەپەرستەکان و پێشکەوتوەکانیەوە باشترە بۆ خۆتانی ببەنەوە.

ئەگەر منەتی ئەوەمان بە سەردا ئەکەن چەند قانونێکتان بۆ ڕێکخستنی وەزارەتە

یەککرتوەکان و تازە داهێنراوەکان داناوە، رەنگە ئەوەشێرپەنجەی گەندەڵی هەڵاوسانی بیرۆکراتی بێ بەرهەمی لە وەزارەتەکان‌دا کوشندەتر کرد بێ.

ئەگەر منەتی ئەوەمان بە سەردا ئەکەن هەمو جار، بە فەرمانی سەرکردایەتی حیزبەکان کۆ بونەتەوە، بێ لێکدانەوەی ئەنجامە مەترسیدارەکانی، بۆ پشتیوانی و پەسەندنی هەڕەشە ئاگراویەکانیان، لە تورکیا وعیراق و ئیران... بەمە ئاڵۆزی سنورەکانتان گرژتر کردوە.

لەماوەی ٣ ساڵی رابوردودا زیاتر لە حەوت ملیار دۆلاری ئەمەریکی لە بودجەی گشتی عیراقەوە هاتۆتە سەر بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، جگە لە داهاتی ناوکوردستان خۆی. کوردستان بە درێژایی مێژوی خۆی بودجەی وا گەورەی بە خۆیەوە نەدیوە. بۆچی رۆژێ لە رۆژان پێتان دانەگرت بڵێن: تاووتوێکردنی بودجە و، گوێزانەوەی بەشەکانی لە کەرتێکەوە بۆ کەرتێکی تر و، ئینجا پەسەندنی جێبەجێکردنی لە دەسەڵاتی ئێمەیە.

## ئەم چەند ملیارە کێ سەرفی کردوە و چۆن و لە چی‌دا سەرف کراوە؟

لە ماوەی ٣ ساڵی رابوردودا گەندەڵی بەهەمو جۆرە دزێوەکانیەوە لە ناو وەزارەتەکان و دائیرەکانیان‌دا بەئەندازەی زیاد بونی بودجەکە زیادی کردوە. بۆچی رۆژێ لە رۆژان پێتان دانەگرت بڵێن: فلانە وەزیر یا فیساریان بانگ بکەن بۆ لێپرسینەوە لە سەر کاروباری وەزارەتەکەی و، ئەگەر گەندەڵی لە سەر بو بە ماڵ، باوەڕی لێ بسێننەوەو حەواڵەی دادگای بکەن.

لە ماوەی ٣ ساڵی رابوردودا چەند جار خەم وپەژارە، سکاڵا و گازاندە، نارەزایی و هەڕەشەکانی خەڵکتان بردە بەردەم پارلەمانەکەتان و، گفتوگۆی جدیتان لە سەر کرد و، هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەریتان دا؟

ئەوە بۆچی کە دێنە سەر خواستە تایبەتیەکانی خۆتان: زیاد کردنی موچە و ئیمتیازات، کرینی سەیارە، کرینی شوقە، وەرگرتنی زەوی، سەفەرکردن بۆ وڵاتانی دەرەوە... بیرتان رۆشن و چاوتان تیژ و زمانتان پاراوە، کەچی لە ئاست خواستەکانی خەڵکدا گوێتان گران و لە ئاست جێبەجێکردنی ئەرکە پارلەمانیەکانتان‌دا لەشتان قورسە؟.

ئێوە ئەی ئەندامانی بەڕێزی پارلەمانی کوردستان! لە بەردەم پرسیارێکی مێژوویی‌دان: لە خەمی کێ دان جگە لە خۆتان؟

# گۆڕان لێرەوە دەس پێ ئەکا: جیاکردنەوەی حیزب لە حکومەت*

حیزب لە کوردستان‌دا ئامرازی خەباتی چینایەتی، نیشتمانی، نەتەوەیی بوە. حیزب، سازدەر و ڕێکخەری هێز و تواناکانی گەلی کورد بوە بۆ بەرەنگاری داگیرکەرانی کوردستان و، پاراستنی لە داڕمان و توانەوە و فەوتان و، داکۆکی لە خواستەکانی و بەدەسهێنانی مافەکانی.

حیزب، لە مێژوی سەد ساڵەی ڕابوردوی کوردا دەوری بڕیاردەر و کاریگەری هەبوە لە هەمو وەرچەرخانە سیاسی و کۆمەڵایەتی و لە روداوە گرنگەکانی کوردستان و دەوڵەتانی داگیرکەردا.

کوردستانی عیراق دو جار هەلی بۆ هەڵکەوتوە بە ئازادی حیزبایەتی تێدا بکرێ:

جاری یەکەم، دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ کە ڕژێمی پاشایەتی ڕوخا و ڕژێمی جمهوری دامەزرا. هەمو حیزبە سیاسیەکانی ئەوسای عیراق کەوتنە چالاکی ڕیکخراوەیی، سیاسی، ڕۆشنبیری، ڕۆژنامەوانیی ئاشکرا، لە ناو ئەوانەش‌دا هەردو زلحیزبەکەی ئەوسای کوردستان: حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیموکراتی کوردستان. بەڵام بەهاری ئازادی عیراق زۆری نەخایاند. دیسان داوودەزگای ئازادی هەڵپێچرا. سەردەمی کودەتاییەک لە سەریەک و دیکتاتۆری و کوشتن و بڕین دەستی پێ کردەوە. شۆڕشی چەکداری کورد هەڵگیرسا. حیزب دەوری سەرەکی گێڕا لە ڕێکخستن و ڕابەری و سازدانی‌دا.

---

★ سایتی سبەی ٥/٨/٢٠٠٧

ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ٣١ لە ٦/٨/٢٠٠٧

جاری دوەم، دوای ڕاپەڕینی ئازاری ١٩٩١ کە دەسەڵاتی سەدام حسێن و ڕژێمی بەعس لە کوردستان دەرکرا، ڕاپەڕین سەرەتای وەرچەرخانێکی بنەڕەتی بو لە مێژوی نوێی کورد و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە تا ئێستاش بەردەوام کار لە ڕوداوەکان ئەکا و ڕوداوەکان کاری تێ ئەکەن. حیزبەکانی کوردستان و، هەندێ لە حیزبەکانی عیراق، دەروازەی کاری ئاشکرا و قانونی یان بۆ کرایەوە.

ڕاپەڕین، شکان و کۆڕەو، گفتوگۆی کوردی — بەعسی، بە دەنگهاتنی کۆمەڵگای ناودەوڵەتی و بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان، یەکەمین هەڵبژاردنی ئازاد بە بەشداری فراوانی خەڵکی کوردستان. پێکهێنانی ئەنجومەنی نیشتمانی و حکومەتی هەرێم... حیزبەکانی کوردستان بە گشتی و، هەندێکیان بە تایبەتی، دەوری کاریگەریان هەبو لە دروستکردنیدا.

*

حیزبەکانی کوردستان چونکە لە هەلومەرجێکی سەختی خەباتی ژێرزەمینی و خەباتی چەکداری خوێناویدا لە دایک بون و دامەزراون و گەشەیان کردوە، ڕێکخستنەکانی خۆیان بە پێی سەرەتا ڕێکخراوەیی و سیاسی و لە سەر شێوەی حیزبە شیوعیەکانی یەکێتی سۆڤێتی جاران دامەزراندوە.

ئەگەر وا نەبونایە بەرگەی پەلاماری دەسەڵاتی داگیرکەریان نەئەگرت. بۆیە پەیکەرەی ڕێکخراوەیی حیزب کە لە شانەوە دەس پێ ئەکا تا ئەگاتە مەکتەبی سیاسی زۆرتر لە پەیکەرەی ڕێکخراوەیی لەشکر و سپا و جەیش ئەچێ تا حیزبی پارلەمانی.

*

لە دوای ڕاپەڕینەوە قۆناغێکی نوێ لە جوڵانەوەی کورددا دەستی پێ کردوە. ئەگەر جاران حیزب وەسیلەی تێکۆشان بو بۆ بەرەنگاری چەوسانەوەی نەتەوەیی و ڕوخاندنی داودەزگاکانی دەسەڵاتی داگیرکەر و «شەرعیەتی» کارەکانی لە «بەرپاکردنی شۆڕش» و بەرەنگاریەوە وەرئەگرت و ئەرکی سەرەکی «ڕوخاندنی دەسەڵاتی داگیرکەر» بو، ئەوا لە دوای ڕاپەڕینەوە ئەم ئەرکەی حیزب بە تەواوی گۆڕا و ئەرکی تازەی کەوتە سەر شان کە ئەرکی بنیاتنانی دەسەڵاتی قانونی بو.ئیتر لە باتی «شۆڕش» ئەبو ڕێگەی «هەڵبژاردن» بگرێ و لە باتی ئەوەی مەکتەبی سیاسی لە ڕێگەی «شەرعیەتی شۆڕش» و داودەزگا ڕێکخراوەیی و سیاسی و پێشمەرگەیی و دارایی و دیپلۆماسیەکانی

خۆیەوە کاروباری وڵات بەڕێوە ببات پەنا بباتە بەر «شەرعیەتی قانون» و دامەزراندنی داوودەزگای حکومەتی جیا لە دەسەڵاتی حیزب.

*

ئێستا لە کوردستان هەر سێ دەسەڵات: تەشریعی، تەنفیزی، قەزائی، دامەزراوە. ئەم دەسەڵاتانە هەن و ڕۆژانە دەوام ئەکەن. بەڵام هەر سێکیان لە لایەن حیزبەوە دروست کراون و حیزب ئاراستەیان ئەکات و، بە پێی فەرمان و ڕێنمایی و ئامۆژگاری حیزب و لەو چوارچێوە سنوردارەدا ئەجوڵێن کە حیزب بۆی دیار کردون. لە کوردستان، وەکو ئەوروپای شەرقی جاران، حیزب زاڵە بە سەر هەمو داوودەزگا دەوڵەتیەکاندا. دڵسۆزی بۆ حیزب، نەک نیشتمانپەروەری و لێهاتویی، دەوری بڕیادەری هەیە لە دامەزراندنی فەرمانبەر و کارمەندەکانی حکومەتدا هەر لە مجەوری مزگەوت و فەڕاشی بنکەی تەندروستی و خوێندنگەی گوند و پۆلیسی دارستانەوە تا ئەگاتە سەر بەڕێوەبەری گشتی و جەنەڕاڵ و وەزیر و سەفیر. حیزب، ئەمانە بە کار ئەهێنێ بۆ فراوان کردنی نفوز و دەسەڵاتی خۆی، بە تایبەتی هی سەرکردەکانی.

حیزبی کوردستانی، دوای دو هەڵبژاردنی گشتی بۆ ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان و، هەڵبژاردنێک بۆ پارلەمانی عیراق و هەڵبژاردنێک بۆ شارەوانیەکان و هەڵبژاردنێک بۆ ئەنجومەنی پارێزگاکان و دەیان هەڵبژاردنی جۆراوجۆری ڕێکخراوی پیشەیی و جەماوەری، لە باتی کرانەوەی زۆرتر بە ڕوی ئازادی تاک و کۆمەڵ و چەسپاندنی دیمۆکراسی، سیستەمێکی تۆتالیتار (شمولی)ی دامەزراندوە ڕۆژانە دەس ئەخاتە هەمو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵ و تاکەوە، تەنانەت دەس ئەخاتە ناو جموجوڵی وەرزش و هونەر و لێکۆڵینەوەی زانستیەوە.

سیستەمی سیاسی ئێستای کوردستان زیاتر لەوەی لە سیستەمی دیمۆکراتی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا بچێ، یان لە سیستەمی نیمچە دیمۆکراتی وڵاتانی ئاسیایی وەکو هندستان، پاکستان، مالیزیا.. بچێ زۆرتر لە سیستەمی تۆتالیتاری ئەوروپای ڕۆژهەڵاتی سەردەمی حوکمی حیزبە کۆمۆنیستەکان ئەچێ.

کاربەدەستانی حیزب بونەتە چینێکی تازەی دەسەڵاتداری خاوەن ئیمتیاز لە ناو کۆمەڵدا، هەمو دەسکەوتێکی مادی و هەمو شتێکی باشیان بۆ خۆیان ئەوێ، پێیان وایە خەڵک بۆ خزمەتی ئەوان دروست بوە، لە بەرئەوە ئەو متمانە سیاسیەی جاران خەڵک بە حیزبیان هەبو ئێستا زۆری لە دەس داوە. بەو جۆرەی کە ئێستا کوردستان بەڕێوە ئەبرێ ناڕەزاییەکی زۆری لە ناو خەڵک

و ئەندامانی بنکەکانی خوارەوەی حیزبەکان‌دا دروست کردوە. کار بەمجۆرە بڕوا سەرەنجامی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە سەرەنجامی حکومەتەکانی یەکێتی سۆڤێتی جاران و بلۆکی ڕۆژهەلات باشتر نابێ.
بۆ ئەوەی تەجروبەی کوردستان بە دەردی تەجروبەی دەولەتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات نەچێ ئەبێ لە هەر سێ دەسەلاتدا: لە دەسەلاتەکانی تەشریعی و تەنفیزی و قەزاییدا، گۆڕینی بنەڕەتی بکرێ، حیزب قەدەغە بکرێ لە دەستێوەردانی ڕۆژانەی کاروبارەکانیان، دەسەلات لە دەس دەزگا حیزبییەکانەوە بگوێزرێتەوە بۆ دەزگا دەولەتیەکان. هەر سێ دەسەلات لە واجیهەی حیزبەوە ببنە دەسەلاتی ڕاستەقینەی دەولەت:

## یەکەم، ئەنجومەنی نیشتمانیی ببێتە پارلەمان

وەزیر لە هەر حیزبێک بێ و لە هەر پلەوپایەیەکی حیزبی‌دا بێ بانگ بکرێت بۆ بەردەم پارلەمان بۆ لێپرسینەوە. خەمی ڕۆژانەی خەلکیان لە گەل باس بکا. ئەگەر پێویستی کرد باوەڕیان لێ بسێنێتەوە تەنانەت ئەگەر پێویستی کرد بیدا بە دادگا.
هیچ یاسایەکیان بە سەردا نەسەپێنرێ، ئەگەر سەپێنرا ئەوەندە ئازا بن قبولی نەکەن. ئازاد بن لە لێکۆلینەوە و هەلسەنگاندن و دەسکاری، تەنانەت ڕەتکردنەوەی پرۆژەی قانونەکان‌دا.
بودجەی سالانە، داهات و دەرچو، لە پارلەمان‌دا باس بکرێ. ئەو پارەیەی حیزب لە دارایی گشتی بۆ کاروباری تایبەتی خۆی وەری ئەگرێ بخرێتە بەرچاوی خەلک.
ئەگەر پارلەمان، لە ئێستا و لە پاشەڕۆژدا، ئەم ئەرکانەی پێ جێبەجێ نەکرا سەرۆکایەتی هەرێم هەلی بوەشێنیتەوە و، ڕێگە بدا بە خەلک بۆ تازە کردنەوەی هەلبژاردن و نوێ کردنەوەی پارلەمان.

## دوەم، ئەنجومەنی وەزیران ببێتە دەزگای بڕیاردان

وەزارەت کۆبونەوەی دەوری بکا و، لە کۆبونەوەکانی‌دا بەرنامەی گشتی کابینە و، بەرنامەی تایبەتی وەزارەتەکان هەلبسەنگێنێ و بڕیاری لێ بدا و

ئاشكرای بكات. وەزارەت ببێتە دەزگای بڕیاردانی تەنفیزی.

ئەو وەزارەتەی لە ئەنجامی پێكهاتنی حیزبەكان و، لە ناو حیزبەكانیشدا لە ئەنجامی بەلاداكەوتنی ململانێی تەكەتولەكان، دروست ئەكرێن، بۆ ئەوەی رەئی سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیرانیان لە سەر وەربگیرێ و، بۆ ئەوەی رێگە بە پارلەمان بدرێ بە ئازادی دەنگیان لە سەر بدەن: باوەڕیان بدەنێیان باوەڕیان پێ نەدەن، سەروەزیران چەند بە توانا بێ و، وەزیرەكانی چەند لێوەشاوە بن كارێكی ئەوتۆیان پێ ئەنجام نادرێ جێگەی رەزامەندی گەل بن.

ئەگەر وەزارەتێ لە توانای‌دا نەبێ، یا نەیویست، ببێتە وەزارەتێكی كارای لەو بابەتە، سەرۆكایەتی هەرێم پێویستە هەڵی بوەشێنێتەوە و وەزارەتێكی نوێ تەكلیف بكا دەس بە كار بێ لە ئاستی جێبەجێ كردنی فرمانەكانی‌دا بێ.

## سێیەم، ئەنجومەنی قەزایی ببێتە دەزگایەكی پیشەیی

دەسەڵاتی حیزب بە تەواوی لە داد دور بخرێتەوە و، رێ نەدرێ داوودەزگا حیزبییەكان دەس بخەنە كاروباری دادگاوە. حیزب هیچ دەورێكی نەبێ لە دامەزراندنی دادوەر و كارمەندانی تری دەزگای قەزایی‌دا و بە هیچ جۆرێ رێ نەدرێ، راستەوخۆیا ناڕاستەوخۆ، دەس وەر بداتە رەوتی كارەكانی دادگا و بڕیارەكانیەوە. هەر دادوەرێیا كارمەندێكی ئەم دەزگایە پیشەیەتی و بێلایەنی لە دەس دا دەسبەجێ دور بخرێتەوە. ئەوەش كە هەیە سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنرێتەوە، پاشماوەی سەردەمی شەڕی ناوخۆ و ململانێی حیزبایەتی لێ پاك بكرێتەوە.

*

جیاكردنەوەی دەسەڵاتی حیزب لە حكومەت بە مەعنای فت كردنی حیزب و كوژاندنەوەی دەوری حیزب نیە لە ژیانی سیاسی وڵات و لە كاروباری گشتی‌دا، بەڵكو حیزبایەتی و سیستەمی فرە حیزبی كۆڵەكەی سەرەكی سیستەمی دیمۆكراتیە. ژیانی دیمۆكراتی بە بێ ململانێی حیزبی و، بە بێ دوبارەبونەوەی نۆرەیی هەڵبژاردن و، بە بێ بونی موعارەزەی ناوپارلەمانی و دەرەوەی پارلەمانی و بە بێ بونی میدیای ئازاد... وتەیەكی بۆشە.یەكێ لە گەورەترین هەڵەكانی حیزبەكانی كوردستان، لە كاتی دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی كوردی‌دا، لە دوای راپەڕین، تێكەڵاو كردنی دەسەڵاتی حیزب و حكومەت بو. ئەو هەڵەیەی

کۆمەڵی کوردی دوچاری چەندین دەردی گران کرد، لە سەرو هەموویانەوە شەڕی ناوخۆ، میدیای دەسبەسەر، بێدادی کۆمەڵایەتی، گەندەڵی جۆراوجۆر.

ئێستا کاتی ئەوە هاتوە ئەو هەڵەیە راست بکرێتەوە، دەسەڵاتی حیزب لە حکومەت جیا بکرێتەوە.

# کێ بەرپرسە لە جێبەجێ نەبونی مادەی ١٤٠؟ ئەمریکا، عەرەب یان کورد؟★

ئێستا کە باسی مادەی ١٤٠ی دەستوری عیراق ئەکرێیەکسەر ناوی کەرکوک ئەهێنن، لە کاتێکا ناوچە کوردستانیەکانی دابڕاو لە هەرێمی کوردستان، کە دەیان ساڵە جێگەی ناکۆکی کورد و عەرەبە و دەیان ساڵە هۆی ناکۆکی سیاسی و شەڕی چەکدارە، بە تەنیا کەرکوک نیە، بەڵکو ناوچەیەکی فراوانە لە مەندەلیەوە دەس پێ ئەکا بە خەتێکی راست بە ناو حەمرین دا درێژ ئەبێتەوە تا ئەگاتە شەنگار. ئەم ناوچەیە نزیکەی سێیەکی ئەرزی کوردستانی عیراقە.

کێشەی ئەرزیی لە نێوان کورد و حکومەتەکانی عیراقایەکێ بوە لە کێشە سەرەکیەکانی کە هەمیشە کۆسپی رێگەی لەیەک نەگەیشتن و رێک نەکەوتن بوە لە هەمو گفتوگۆکان دا. سەدام و رژێمی بەعس بە درێژایی تەمەنی حوکمڕانی خۆیان چارەسەری ئەم کێشە ئاڵۆزەیان بە هۆی جێبەجێ کردنی سیاسەتی تەعریب و تەرحیل و تەهجیرەوە ئاڵۆزتر و سەختتر کرد. دوای روخانیشی، ئەم کێشەیە کە بە میرات بە جێ مابو، سەرلەنوێ بە زەقی و قەڵبە قەڵباوی هاتەوە سەر مێزی باس و لێدوان و، ئەمجارەیان تورکمانیش بونە لایەکی گیروگرفتەکە.

مەجلیسی حوکم کە پێکهات، کورد جگە لەوەی بەشدارێکی گرنگ بو لە مەجلیسەکەدا، رۆڵێکی سەرەکیشی هەبو لە کۆکردنەوەی ئەو هەمو هێزە ناکۆکانەدا و، لە دروستکردنی دا. ئەوسا هەمو لایەنەکانی بەشدار و پێکهێنەری مەجلیس، جگە لە لایەنە کوردیەکان، لاواز و بێدەسەلات و لە ناو گەلی عیراق دا کەم ناسراو بون، کورد ئەیتوانی زۆر لە

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٧/٨/٢٧

رۆژنامەی رۆژنامە ٤١ لە ٢٠٠٧/٨/٢٠

خواستە نەتەوەییەکانی خۆی، لەوانە خواستە ئەرزیەکانی، بەوان بسەلمێنێ. بەڵام کورد هیچ پرۆژەیەکی ئامادەکراوی نەبو بۆ ناوچە کوردستانیەکانی دەرەوەی هەرێم، لە بەر ئەوە ئەم کێشە گرنگە دواکەوت تا کاتی نوسینی قانونی ئیدارەی دەوڵەت و لەوێدا ناوچە ناکۆکەکان حەواڵەی راپرسی کران. سەرکردایەتی کورد دو جار توشی هەڵەی سیاسی مێژویی بوە لە گفتوگۆکانی دا سەبارەت بە کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی کوردستانی عیراق، کە راستکردنەوەیان کارێکی دژوارە:

جاری یەکەم، ساڵی ١٩٧٠ لە گفتوگۆکانی رێکەوتنی ئازاردا کاتێ قبوڵی کرد چارەنوسی ناوچە کوردستانیەکان، بە تایبەتی کەرکوک، لە رێگەی راپرسیەوە بەلادا بخرێ.

جاری دوەم، ساڵی ٢٠٠٣ لە مەجلیسی حوکم و کاتی نوسینی قانونی ئیدارەی دەوڵەت دا کاتێ کە دیسان قبوڵی کرد چارەنوسی ناوچە کوردستانیەکان بە راپرسی بە لادا بخرێ.

گەلان ئامادە نین دەس لە بستێ ئەرزی نیشتمانەکەیان هەڵبگرن. هیچ کەسێ مڵکی خۆی ناخاتە راپرسیەوە و، هیچ گەلێ ئەرزی نیشتمانەکەی ناخاتە راپرسیەوە، بە تایبەتی ئەگەر لە لایەن هێزێکی لە خۆی بەهێزترەوە داگیر کرا بێ و دیمۆگرافیای گۆڕا بێ. بەڵکو بە هەمو رێگەیەک هەوڵی سەندنەوەی ئەدا. بەڵام سەرکردایەتی کورد ئەوەشی قبوڵ کرد و، لە مادەی ٥٨ی قانونی ئیدارەدا رەنگی دایەوە.

گەلان، تەنانەت ئەگەر سەر بەیەک نەتەوەش بن، دەس لە ئەرزی نیشتمانەکەی خۆیان هەڵناگرن بۆ لایەنەکەی تر، ئەگەر لە هەمان نەتەوەیش بن: قەتەر و سعودیە،یەمەن و سعودیە، ئەمارەتەکانی خەلیج، دەوڵەتانی سەروی ئەفریقا: جەزائیر و مەغریب، پۆلیساریۆ و مەغریب، لیبیا و چاد.. لە سەر هەندێ ناوچەی سنوری ناکۆکن و، هەندێ جار ناکۆکیەکانیان ئەبێتە هۆی دروستکردنی گرژی سیاسی و ئابوری لە پێوەندیەکانیان دا. مادەی ٥٨ کە دوایی بو بە بڕگەی مادەی ١٤٠ هەر لە سەرەتاوە پێویستی بەوە هەبو کورد لە باری سەرنجی خۆیەوە رونی بکاتەوە و، میکانیزمی جێبەجێ کردنی هەمو پرۆسەکەی لە دەس پێکردنەوە تا تەواو بون، دابنایە. دوای ئیمزاکردنی قانونی ئیدارەی دەوڵەت دەسەڵات درایە دەست عیراق. غازییاوەر بو بە سەرکۆمار، ئەیاد عەلاوی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، فوئاد مەعسوم بو بە سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانی. لە سەردەمی حکومەتەکەی عەلاوی دا مادەی ٥٨ بە خەوتویی مایەوە.

هەڵبژاردنی گشتی کرا. ئەنجومەنی نیشتمانیی عیراق هەڵبژێردرا کە ئەبو دەستوری دایمی عیراق بنوسێ. د. جەعفەری بە هاوبەشی کورد وەزارەتی پێک هێنا.یەکێ لە مەرجەکانی کورد بۆ هاوبەشی لە وەزارەتەکەی جەعفەری دا، جێبەجێ کردنی مادەی ٥٨

بو. بەڵام تا حکومەتەکەی جەعفەری لە سەر کار بو نە جەعفەری مادەکەی جێبەجێ کرد و نە کوردیش هیچ بەرنامەیەکی جدی دانا بۆ جێبەجێ کردنی و نە هیچ گوشارێکی جدی یان لە سەر دروست کرد تا ئەویش ناچار بێ مادەکە جێبەجێ بکا، بەڵکو سەرکردایەتی کورد و نوێنەرەکانی بە هیوای ئەمەریکا بون بۆیان جێبەجێ بکا، بە تایبەتی سەفیر نیگرۆپۆنتی نامەیەکی لەو بارەیەوە بۆ نوسی بون.

دەستوری عیراق نوسرا، مادەی ٥٨ی قانونی ئیدارەی دەوڵەت بو بە مادەی ١٤٠ی دەستوری دائیمیی و کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ دانرا بە کاتی جێبەجێ کردنی دوا قۆناغی. دەستور لە لایەن زۆرایەتی گەلی عیراقەوە دەنگی پەسەندنی لە سەر درا. مادەی ١٤٠ جێگیر بو.

کورد ئەبو بۆ هەر قۆناغێ لە قۆناغەکانی مادەی ١٤٠ پرۆژەی تایبەتی جیا جیای لایەنی زۆر و لایەنی کەمی ئامادە بکردایە:

- ئەو ناوچانەی کورد داوای ئەکا و ناکۆکییان لە سەرە کامانەن و سنورەکانیان لە کوێ دەس پێ ئەکا و لە کوێ تەواو ئەبن.
- ئاساییکردنەوە چۆن ئەکرێ، عەرەب و کورد چۆن ئەگەڕێنرێنەوە شوێنەکانی خۆیان. تورکمان چۆن رازی ئەکرێ. سنوری ئیداری کام گوند و ناحیە و قەزا و پارێزگا پێویستی بە گۆڕینە.
- سەرژمێر چۆن ئەکرێ و لە کوێ ئەکرێ و کێ ئەیکا. حکومەتی عیراقیان داوودەزگایەکی بێلایەنی ناودەوڵەتی ئەنجامی ئەدا.
- دوای سەرژمێر کێن ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیە لە راپرسیەکەدا و لە سەر چ بنچینەیەک ئەوە دیاری ئەکرێ.
- لە کام ناوچەدا راپرسی ئەکرێ. لە سەر ئاستی گوند، ناحیە، قەزا، پارێزگا راپرسی ئەکرێ. دەنگدەرانی هەر شارە بە جیا حساب ئەکرێ یان هەمو پارێزگاکە پێکەوە.
- کێ سەرپەرشتی ئەنجامدانی راپرسی ئەکا و کێ ئەنجامەکانی دەرئەهێنێ.

ئەم پرسیارانە و زۆر پرسیاری تر پێویستیان بە وەڵام هەبو. کورد ئەبو پرۆژەی بۆ هەمویان ئامادە و بودجەی بۆ هەمویان تەرخان بکردایە.

***

سەرلەنوێ هەڵبژاردنی گشتی لە عیراق کرایەوە. لە کاتی دروستکردنەوەی وەزارەت دا ئەمجارە کورد پێیان داگرت لە سەر ئەوەی کە نابێ جەعفەری ببێتە سەروەزیر، لە

بەر ئەوەی بەڵێنەکانی سەبارەت بە مادەی ٥٨ جێبەجێ نەکردوە. ئیئتیلاف بە ناچاری مالیکی‌یان لە شوێنی جەعفەری دانا.

لە دانوسەندنێکی چەند مانگیی دا سەرکردایەتی کورد رێککەوتنێکیان لە گەڵ مالیکی ئیمزا کرد کە:
- تا کۆتایی ٢٠٠٧ مادەی ١٤٠ بە هەر سێ قۆناغەکەیەوە:
ئاساییکردنەوە، سەرژمێر، راپرسی، جێبەجێ بکا.
- هەر کات گروپی هاوپەیمانی کوردستان لە کابینەکەی کشانەوە، کابینەکە هەڵبوەشێتەوە و پارلەمانی عیراقی کابینەیەکی تر دابمەزرێنێ. کورد کارتێکی بە هێزی بە دەستەوە بو.

بە مەبەستی بە دوادا چونی جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠ لە کوردستان وەزارەتێکی تایبەتی دامەزرا و، لە بەغداش کۆمیتەیەکی وەزاری پێک هات.
لەو ماوەیەدا نە کۆمیتە وەزاریەکەی بەغداد هیچی لە قۆناغەکانی مادەی ١٤٠ جێبەجێ کرد و نە نوێنەرەکانی کورد لە بەغداد: ئەندامانی وەزارەت و پارلەمان، هیچ گوشارێکی جدییان بۆ سەر مالیکی دروست کرد، چ بە کشانەوەیان یا بە هەرەشەی کشانەوەیان لە وەزارەتەکەی مالیکی.

سەرکردایەتی کوردیش لەم کەمتەرخەمیە بێدەنگ بو. جا لێرەدا ئەگەر گلەیی بکرێ، ئەبێ لە کێ بکرێ:
- لە ئەمەریکا؟ کە ستراتیجی تایبەتی خۆی هەبو لە عیراق دا و کورد بەشێکی بچوکی ئەو ستراتیجە بو. ئەیویست هاوسەنگی رابگرێ لە نێوان خواستەکانی کورد و نارەزایی تورکیا و دەوڵەتانی عەرەبی دا.
لە مالیکی؟ کە ئەیەوێ نوێنەرایەتی بەرژەوەندی نەتەوەیی عەرەبی عیراق بکا و گلەیی نەتەوەپەرستەکانی عەرەب نەهێنێتە سەر خۆی؟ لە نوێنەرانی کورد؟ کە گێڕانەوەی ناوچە کوردستانیەکانیان کرد بوە دروشمی سەرەکی هاندانی کورد بۆ بەشداری لە پرۆسەی سیاسی عیراق و هەڵبژاردنەکان دا.

***

**تەنیا بۆ بیرهێنانەوە:**

رەنگە هەبن گلەیی لە من بکەن کە بۆچی لە کاتی خۆی دا ئەو بیروڕایانەم دەرنەبڕیوە. لێرەدا دەقی ئەو وتارە ئەنوسمەوە کە لە ژمارەی رۆژی ٧ی ١ی ٢٠٠٤ی رۆژنامەی «کوردستانی نوێ»دا بڵاوم کردۆتەوە و، ئەم وتارە وەکو بەڵگەیەک بۆ سەلماندنی توندڕەوی سیاسی من و هەندێ لە هاوڕێکانم لای چەند لایەنی عەرەبی و نەعەرەبی دژی من بە کار هێنرا.

ئەو کاتەی ئەم وتارە بڵاو کرایەوە: هێشتا «قانون اداره الدوله للفتره الانتقالیه» و مادەی ٥٨ نەنوسرا بو، هێشتا دەستوری عیراق و مادەی ١٤٠ نەنوسرا بو. نە عەلاوی و نە جەعفەری و نە مالیکی نەبوبون بە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

* * *

## کورد و قانونی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عیراق

### لە ماوەی گواستنەوەدا

لەوەتی دەوڵەتی عیراق دامـەزراوە کورد لە خەباتێکی بێ وچان دا بوە بۆ بە دەسهێنانی مافەکانی. لە ١٩٢١ەوە، کە ئینگلیز دەوڵەتی عیراقی دروست کرد، تا ١٩٩١ کە بە راپەڕین و ئازاد کردنی بەشێکی کوردستان لە دەسەڵاتی بەعس کۆتایی هات، گەلی کورد بە پچڕپچڕی زیاتر لە ٤٠ ساڵ لە گەڵ جەیشی عیراقی و هێزە چەکدارەکانی تری‌دا لە شەڕی چەکداردا بوە. رەنگە ئەگەر رۆژێ لە رۆژان سەرژمێری ژمارەی قوربانیەکانی کورد بکرێ ئەوانەی کە لە لایەن جەیشی عیراقەوە کوژراون لە چەند سەد هەزار تێ بپەڕێ.

دەیان جار دانوسەندن و گفتوگۆی سیاسی لە گەڵ رژیمی مەلەکی و دواتر لە گەڵ رژیمی جمهوری: حکومەتی قاسم، دو خولی حکومەتی بەعس، دو حکومەتی دو عارف، نەیتوانی کۆتایی بە ناکۆکی سیاسی نێوان کورد و حکومەتی عیراق بهێنێ. حکومەتەکانی عیراق کوردیان بە دوژمنی سەرسەختی خۆیان دائەنا و، کوردیش حکومەتەکانی عیراقی بە داگیرکەری نیشتمانەکەی ئەزانی.

رژیمی بەعس و دەسەڵاتی سەدام بە تەنیا بۆ کورد و بۆ گەلی عیراق مەترسی نەبو، بو بە مەترسی بۆ سەر گەلان و دەوڵەتانی ناوچەکە، هەڕەشەیەکی راستەقینە بو بۆ سەر ئاسایش و قازانجی نیشتمانی‌یان. سەرەنجام بو بە مەترسی بۆ بەرژەوەندی‌یەکانی گەورەترین زلهێزی دنیا، واتە ئەمەریکا. ئەم مەترسی‌یە و ئەم هەڕەشەیە هەر بە هێزێکی

گەورەی وەکو ئەمەریکا چارەسەر ئەکرا. ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی لە پەلامارێکی کورت و توندوتیژدا رژێمی تۆتالیتاری بەعس و دەسەڵاتی دیکتاتۆریی سەدامی روخان. جەیشەکەی و هێزە چەکدارەکانی لە ماوەی ٣ حەفتەدا تەفروتونا کرد. عیراق وەکو دەوڵەت، وەکو حکومەت، وەکو دەسەڵاتی سیاسی و جەنگی و پۆلیسی و داوودەزگای بەڕێوەبەرایەتی، هەرەسی هێنا. کورد لە هەڕەشەیەکی گەورە و راستەقینە، کە دەوڵەتی کۆنی عیراق بو، رزگاری بو.

٭٭٭

دەوڵەتی عیراق سەر لە نوێ دروست ئەکرێتەوە. جا بۆ ئەوەی دەوڵەتی نوێی عیراق نەبێتەوە بە هەڕەشە و مەترسی بۆ کورد، کورد لە دارشتنەوەی دەوڵەتی نوێی عیراق دا ئەبێ چی بکا و ئەتوانێ چی بکا؟ سەرکردایەتی ئێستای کورد بۆ ئەوەی نەوەکانی داهاتوی لە جیاوازی رەگەزی بپارێزێ و، پاشەرۆژێکی ئارام و ئاسودەیان بۆ دابین بکا ئەبێ:یەکەم، پارێزگاری قەوارەی فیدرالی هەرێمی کوردستان بکا. هەوڵ بدا دەسەلات و سامان لە نێوان حکومەتی هەرێم و حکومەتی ناوەندا بە جۆرێکی عادلانە دابەش بکا و، سنوری جوگرافی ناوچەکەی دیاری بکا دوەم، بونی بەردەوامی کاریگەر و چالاکی هەبێ لە ناوەندا. دابڕانی کورد لە ناوەندی بڕیاردانی عیراقی کورد ئەخاتەوە بەر مەترسی ئەوەی ببێتەوە بە هاوولاتی پلەی دوەم و، هەمو دەسکەوتە قانونی، سیاسی و ئابوری‌یەکانی لێ بسەنرێتەوە. ئەمەیش لە دو لایەن دا خۆی ئەنوێنێ: لایەنی تیۆری، رەنگدانەوەی مافی نەتەوەیی کورد، ئێستا لە (**قانون إدارە الدولە العراقیە**) و لە دوارۆژدا لە (دەستور) دا. کە گرنگترینیان: سەلماندنی پێکهاتنی گەلی عیراقە لە دو نەتەوەی سەرەکی کورد و عەرەب و، پێکهاتنی سەرزەمینی عیراقە لە کوردستان و باقی پارێزگاکانی عیراق و، هاوبەشی هەردو نەتەوەی کورد و عەرەبە لە دەوڵەت و هەمو داوودەزگا جۆراوجۆرەکانی‌دا.

## لایەنی عەمەلی، نواندنی کورد:

لە پارلەمانی ناوەندی‌دا چۆن ئەبێ و، لە کابینە و داوودەزگاکانی حکومەتی ناوەندی‌دا چەند ئەبێ و، بەشی لە بودجەی ناوەندی‌دا چەند ئەبێ؟

ئەبێ گروپی کورد لە مەجلیسی حوکم دا هەوڵ بدا خواستەکانی کورد: چ ئەوی پێوەندی بە کوردستان (بە هەرێمەوە) هەیە و، چ ئەوی پێوەندی بە دەوڵەتی عیراق (بە ناوەندەوە) هەیە. لە قالبی قانونی دا دابڕێژێ و بیکا بە بەشێ لە مادەکانی (**قانون**

إداره الدوله العراقيه للفتره الانتقاليه).

سەرەڕای هاژوهوژی هەندێ لە دەوڵەتانی دراوسێ، ئێستا تەرازوی هێزی سیاسی لە عیراق دا بە قازانجی کوردە، ئەتوانێ زۆر لە خواستە سەرەکی‌یەکانی بسەپێنێ، ئەگەر ئەم هەلە لەم قۆناغەی ژیانی سیاسی عیراق دا لە دەس بدا و، هەڵی بگرێ بۆ کۆتایی ساڵی ٢٠٠٥، کێ ئەڵێ ئەوسا هەلومەرجی عیراق بە جۆرێ ناگۆڕێ دەوری کوردی تێدا پچوک ببێتەوە.

***

ئەندامانی مەجلیسی حوکم، لە باوەڕهێنانەوە بێ بە ڕەوایەتی مافی کوردیان بۆ ڕازی کردنی دڵی هاوولاتیە کوردەکانیان بێ، هەموویان فیدرالیزم وەکو سەرەتایەک ئەسەلمێنن. لە بەیانی دامەزراندنی مەجلیسی حوکم دا کە ڕۆژی ١٣ی ٧ی ٢٠٠٣ و، لە بەیانە سیاسی‌یەکەی دا کە ڕۆژی ٢٢ی ٧ی ٢٠٠٣ بلاو کرایەوە، لە هەردوکیان دا سەرەتای فیدرالیزم سەلمێنراوە. زۆر لە ئەندامەکانیشی لە گفتوگۆی ڕۆژنامەوانی‌دا سەلماندویانەتەوە. فیدرالیزم شتێکی تازە نیە لە داهێنانی کورد بێ. چەندین دەوڵەتی فیدرالی پچوک و گەورە لە سەرانسەری دنیادا هەیە و، چەندین نمونەی سەرکەوتویان پێشکەشی بیری قانونی و سیاسی مرۆڤایەتی کردوە، کەچی فیدرالیزم لە عیراق دا وەکو مەتەڵی لێ هاتوە. هەریەکە بە جۆرێ لێکی ئەداتەوە. کە دێنە سەر باسی ڕێکخستنی پێوەندی نێوان کوردستان و ناوەند و، باسی جۆری فیدرالی و دەسەلاتەکانی و سنوری جوگرافی، ئەیانەوێ هەڵبگیرێ بۆ کاتی هەڵبژاردنی گشتی و نوسینی دەستور.

***

ئێستا کە (قانون اداره الدوله العراقيه للفتره الانتقاليه) ئەنوسرێ، قۆناغێکی گرنگە لە ژیانی کورد و لە ژیانی عیراق دا. لەم قانونەدا ئەشێ سیمای دەوڵەتی عیراقی نوێ و، سنوری مافە نەتەوەییەکانی کورد دیاری بکرێ. کاتی گوڵبارانی کاربەدەستانی ئەمەریکی و (موجامەلە)ی هێزە سیاسی‌یەکانی عیراق بە سەر چو. کاتی پێ داگرتنە لە سەر چەسپاندنی مافە نەتەوەییەکانی کورد. دواخستنی باسی مافەکانی کورد بۆ کاتی هەڵبژاردنی گشتی و نوسینی دەستور، بیانویەکی زیرەکانەیە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب لە ناو مەجلیسی حوکم دا، بە کاری ئەهێنن بۆ نەسەلماندنی مافە سەرەکییەکانی کورد. بۆیە نابێ سەرکردایەتی کورد هیچ بیانویەک بۆ دواخستنی قبوڵ بکا و، ئەبێ سور بێ لە سەر چەسپاندنی مافەکانی خۆی و دانپیانانی هەرچی زوتری‌دا. ئەگەر لەمەدا، بە ڕێگەی گفتوگۆ لە گەڵ مەجلیسی حوکم و سوڵتەی ئیئتیلاف، نەگەیشتە ئەنجام

ئەبێ پێش تەواوکردنی نوسینی قانونەکە و، پێش کۆتایی مانگی شوبات ڕێگەیەکی تر بگرێ، ئەویش ڕێگەی (مقاوەمەتی سەلبی و عسیانی مەدەنی)یە، سولتەی ئیئتیلاف و مەجلیسی حوکم تێ بگەیەنێ:

بەشداریی لە مەجلیسی حوکم دا ڕائەگرێ و، ئەگەر پێویستی کرد لێی ئەکشێتەوە، بەشداریی لە وەزارەتە ناوەندییەکانی بەغدادا ڕائەگرێ و، ئەگەر پێویستی کرد لێی دەرئەچێ و، لەگەڵ سوڵتەی ئیئتیلاف هاوکاری ڕائەگرێ و، بەشداری هەڵبژاردنی داهاتوی مەجلیسی ئینتیقالی و وەزارەتی ئینتیقالی نابێ و، لە پرۆسەی گوێزانەوەی دەسەڵات دا لە سوڵتەی ئیئتیلافەوە بۆ حکومەتی عیراقی بەشداری ناکا، کورد بە هۆی دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە هەڵوێستی خۆی بۆ هەمو دنیا ڕون ئەکاتەوە و، خۆیان ئازادن لە هەڵبژاردنی جۆری بەڕێوەبردنی ناوچەکەیان دا. ڕەنگە ئەمە شارێی سەلماندنی مافەکانی بێ.

***

لە نرخی ئەوەدا ئەبێ گەلی کورد و هەمو هێزە سیاسییەکانی خۆیان ئامادە بکەن بۆ بەرگە گرتنی هەمو جۆرە گیروگرفتێکی ئابوری، بازرگانی، دارایی و، هەمو جۆرە کێشەیەکی سیاسی... کە توشی ناوچەکەیان ئەبێ.

ئاسۆی کوردستان ڕوناکە و، ڕەوتی گۆڕان لە عیراق و ناوچەکەدا بە قازانجی کوردە.

**سلێمانی، ٦ی ١ی ٢٠٠٤**

**نەوشیروان مستەفا**

## مادەی ١٤٠ و نوێنەرانی کورد لە بەغداد

لە دوای روخانی سەدام حسەینەوە نوێنەرایەتی کورد لە بەغداد بونێکی کاریگەر و بەهێزی هەبوە لە دەسەڵاتەکانی تەشریعی و تەنفیزیی عیراقی دا.

لە سەردەمی مەجلیسی حوکم دا:
نوێنەرانی کورد لە مەجلیسی حوکم دا:
مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیمۆکراتی کوردستان
جەلال تاڵەبانی، سکرتێری گشتییەکێتی نیشتمانیی کوردستان
سەلاحەدین بەهادین، سکرتێرییەکگرتوی ئیسلامی
د مەحمود عوسمان، سەربەخۆ
دارا نورەدین، سەربەخۆ

نوێنەرانی کورد لە وەزارەتەکەی مەجلیسی حوکم دا:
وشیار زێباری، وەزیری کاروباری دەرەوە
نەسرین بەرواری، وەزیری شارەوانیەکان
د لە تیف رەشید، وەزیری سەرچاوەکانی ئاو
محەمەد تۆفیق رەحیم، وەزیری پیشەسازی
عەبدورەحمان سدیق کەریم، وەزیری ژینگە

لە سەردەمی د ئەیاد عەلاوی دا (حوزەیرانی ٢٠٠٤):
د رۆژ شاوەیس، جێگری سەرکۆماری عیراق
د فوئاد مەعسوم، سەرۆکی کۆمەڵەی نیشتمانیی عیراق

نوێنەرانی کورد لە وەزارەتەکەی عەلاوی دا:
د بەرهەم ساڵح، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
وشیار زێباری، وەزیری کاروباری دەرەوە
د لەتیف رەشید، وەزیری سەرچاوەی ئاو
نەسرین بەرواری، وەزیری شارەوانی
بەختیار ئەمین، وەزیری مافی مرۆڤ
لە سەردەمی د ئیبراهیم جەعفەری دا (نیسانی ٢٠٠٥):

عارف تەیفور، جێگری سەرۆکی پارلەمانی عیراق
د فوئاد مەعسوم، سەرۆکی فراکسیۆنی کورد لە پارلەمانی عیراق

نوێنەرانی کورد لە وەزارەتەکەی جەعفەری دا:
د رۆژ شاوەیس، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
وشیار زێباری، وەزیری کاروباری دەرەوە
د لەتیف رەشید، وەزیری سەرچاوەی ئاو
د بەرهەم ساڵح، وەزیری پلاندانان
عەبدولباسیت کەریم مەولود، وەزیری بازرگانی
د جوان فوئاد مەعسوم، وەزیری تەلەفۆنات
د هادی ئیدریس، وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی
نەرمین عوسمان، وەزیری کاروباری ژنان

لە سەردەمی نوری مالیکی دا (مایسی ٢٠٠٦):
عارف تەیفور، جێگری سەرۆکی پارلەمانی عیراق
د فوئاد مەعسوم، سەرۆکی فراکسیۆنی کورد لە پارلەمانی عیراق
د رۆژ شاوەیس، نوێنەری کورد لە ئەنجومەنی سیاسی ئاسایشی نیشتمانی عیراقدا

نوێنەرانی کورد لە وەزارەتەکەی مالیکی دا:
د بەرهەم ساڵح، جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران
وشیار زێباری، وەزیری کاروباری دەرەوە
د لەتیف رەشید، وەزیری سەرچاوەی ئاو
فەوزی حەریری، وەزیری پیشەسازی
بەیان دزەیی، وەزیری شارەوانی
نەرمین عوسمان، وەزیری ژینگە

***

## لێپرسینەوە:

هەمو میللەتێ حساب لە گەڵ حیزبەکانی و لە گەڵ نوێنەرەکانی ئەکا لە سەر ئەو بەرنامەیەی دەنگی داوەتێ. وەرگرتنەوەی کەرکوک و ناوچە کوردستانیەکان گرنگترین دروشمی حیزبەکانی کوردستان بو لە هەمو هەڵبژاردنەکان دا بۆ ئەوەی متمانەی

سیاسی خەڵکی کوردستان وەربگرن، با لە نوێنەرەکانی کورد کە لە بەغداد بون و ئێستا لە بەغدادن پرسیار بکرێ: چییان بۆ خۆیان کردوە و چییان بۆ کەرکوک و ناوچە کوردستانیەکان کردوە؟

بۆ خۆیان:
چەندیان پارەی موچەی وەزیری و ئەندام پارلەمانی و دوای گۆڕانیان
چەندیان موچەی خانەنشینی وەرگرتوە
چەندیان خانو و زەوی وەرگرتوە
چەند سەیارەیان وەرگرتوە
چەند حیمایەیان دامەزراندوە
چەندیان لە خزم و دۆست و ناسیاوی خۆیان دامەزراندوە
چەند جار سەفەری دەرەوەیان کردوە
چەند عەقدیان ئیمزا کردوە
بەڵام بۆ کەرکوک و ناوچە کوردستانیەکان چییان کردوە؟

# دیسانەوە مادەی ١٤٠: هەڵسەنگاندنێکی جیاواز *

مادەی ١٤٠ بە رواڵەت چەند برگەیەکی کورتە و هەر برگەیەکی چەند رستەیەکە، بەلام لە ناو ئەو برگە و رستانەدا تۆرێکی ئالۆزی باس و بابەت و کێشەی جیاواز هەیە، هەر یەکێکیان پێویستی بە لێکۆڵینەوەی چەندین شارەزا و دانانی چەندین سیناریۆ و پرۆژەی جیاواز و پلانی ژمارەیەک و ژمارە دو و ژمارە سێ هەبو، کە ئەبو بکرایە و نەکراوە.

برگەی ج مادەی ١٤٠ باسی ناوچە ناکۆکەکان ئەکا، ناوچە ناکۆکەکان کوێیە؟

سنوری ئێستای هەرێمی کوردستان ئەو سنورەیە کە دوای راپەرینی ١٩٩١ رژێمی بەعس دەسەلات و دەزگای ئیداری خۆی لە هەندێکی کێشایەوە و لە هەندێکیشی خەلک دەری کردن.

ئەم سنورە، جگە لە چەند ناوچەیەکی بچوک، هەمان سنورە کە رژێمی بەعس و سەدام حسەین، لە جەنگەی دەسەلاتیان دا، وەکو سنوری ناوچەی کوردستانی حوکمی زاتی دانیان پێ دا ئەنا. پێش روخانیشی بە چەند ساڵێ ئامادە بو، بە هەمان سنورەوە، دان بە حوکمی فیدراڵی دا بنێ و، پەیوەندی لە گەڵ هەرێمی کوردستان ئاسایی بکاتەوە.

بەعسیەکان لە گفتوگۆکانیان دا لە گەڵ نوێنەرایەتی کورد، لایەنی کەم ئەو دو جارەی خۆمی تێ دا بەشدار بوم: ساڵی ١٩٨٤ لە گفتوگۆییەکێتی — بەعس دا و، جاری دوەم ساڵی ١٩٩١ لە گفتوگۆی بەرەی کوردستانی — بەعس دا، خواستە ئەرزیەکانی کوردیان ئەکردە سێ جۆر:

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٧/١٠/٩

رۆژنامەی رۆژنامە ٧٧ لە ٢٠٠٧/١٠/٩

جۆری یەکەمیان، ئەو ناوچانەی (کوردی)ین، بەڵام لە سۆنگەی هەلومەرجی نائاساییەوە (لأسباب طرفیة) لەو قۆناغەدا ئەوان ئامادە نین بیخەنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی.

جۆری دوەمیان، ئەو ناوچانەی ناکۆکیان لەسەرە، کورد بە هی خۆی ئەزانێ و ئەوانیش بە هی عەرەبی دائەنێن، ئامادەن گفتوگۆی لەسەر بکەن بۆ ئەوەی جۆرێ لە تێگەیشتنی هاوبەشی بۆ بدۆزنەوە.

جۆری سێیەمیان، ئەو ناوچانەی (عەرەبی)ین کورد بۆ سەودای ناو گفتوگۆ ناوەکانی ریزکردون، ئەوان ئامادە نین گفتوگۆی لە سەر بکەن.

نوێنەرایەتی بەعس بە ئاشکرا ناوی هەمو شوێنەکانی ئەهێنا و، لە یەکی جیا ئەکردنەوە و، بۆ هەر یەکێکیان بەهانەی خۆی هەبو.

دوای روخانی رژێمی بەعس و هاتنی ئەمەریکا بۆ عیراق، ئەمەریکیەکان هەمان سنوری ساڵانی ١٩٩١ — ٢٠٠٣ی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی بەعسیان دانا بە سنوری نێوان ئیدارەی کوردی و ئیدارەی ئەمریکی. سەرکردایەتی کورد بێ هیچ ئیعتیرازێ ئەمەیان قوبوڵ کرد. بێگومان ئەمە هەڵەیەکی گەورە بو، ئەبو هیچ نەبێ پێیان دابگرتایە لە سەر هێنانەوەی ناوچە کوردستانیەکانی کە بەعسیەکانیش، بەو هەمو شۆڤێنێتی و رەگەزپەرستیەوە، بە ناوچەی کوردییان دائەنان، بە تایبەتی شوێنانی وەکو: خانەقین، شێخان، مەخمور، شەنگار.. نوێنەرایەتی کورد لە مەجلیسی حوکم دا بە دوی ئەم هەڵە سیاسی — مێژوییەدا، لە کاتی نوسین و ئیمزا کردنی قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق دا سێ هەڵەی تێکەڵاو لە بابەتی سیاسی، قانونی، کارگێری و مێژویی کرد:

هەڵەی یەکەم، ئەو سنورەی ئێستایان لە قانونەکەدا سەلماند و، هەمو ناوچە کوردستانیەکانی دەرەوەی ئەم هەرێمەی ئێستایان بە ناوچەی ناکۆک «متنازع علیها» قبوڵ کرد. وەکو لە مادەی ٥٣ی قانونەکەدا نوسراوە:

« (ا) دان ئەنرێ بە حکومەتی هەرێمی کوردستان دا کە حکومەتی رەسمی ئەو ناوچانەیە کە لە لایەن ئەو حکومەتەوە لە ١٩ی ئازاری ٢٠٠٣ دا بەرێوە ئەبرا لە پارێزگاکانی دهۆک و هەولێر و سلێمانی و کەرکوک و دیالە و نەینەوا. زاراوی (حکومەتی هەرێمی کوردستان) واتە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان و دەسەڵاتی قەزایی هەرێم لە هەرێمی کوردستان دا.

(ب) سنوری هەر ١٨ پارێزگاکە لە ماوەی گواستنەوەدا بێ گۆرین ئەمێنێتەوە.»

هەڵەی دوەم، بەلاداخستنی چارەنوسی هەمو ئەو ناوچانەیان حەواڵەی سەرژمێریکی دیاری نەکراو و، ریفراندۆمێکی «ئەنجام نەزانراو» کرد. وەکو لە مادەی ٥٨ برگەی

ج.ی قانونەکەدا نوسراوە: «بڕیاری هەمیشەیی ناوچە ناکۆکەکان، لەوانە کەرکوک، دوا ئەخرێ تا تەواو بونی ئەم ڕێوشوێنانە: ئەنجامدانی سەرژمێرێکی پاک و ڕون و پەسند کردنی دەستوری دائیمی. ئەو بڕیارەش ئەبێ لە گەڵ سەرەتای ڕەوایەتی‌دا بگونجێ، ویستی دانیشتوانی ئەو شوێنانە لە بەر چاو بگیرێ.»

هەڵەی سێیەم، چارەسەرکردنی کێشە ئەرزیەکانی کوردیان بەست بە کێشە ئەرزیەکانی شیعەی عیراقەوە و، کێشەکەیان زیاتر ئاڵۆز کرد بەوەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی عیراق و ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکانیشیان تێکەڵاو کرد وەکو لە مادەی ٥٨ برگەی ب قانونەکەدا نوسراوە: «ڕژیمی پێشویاری بە سنوری کارگێڕی کردوە بۆ مەبەستی سیاسی گۆڕیوێتی. ئەنجومەنی سەرۆکایەتی حکومەتی گواستنەوەی عیراق چەند ڕاسپاردەیەک ئەدا بە کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ چارەکردنی ئەم گۆڕینە ناڕەوایانە لە دەستوری دائیمی‌دا. لە حاڵەتێکا کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بە کۆی دەنگ نەیانتوانی ڕێک بکەون لە سەر دانانی ئەو ڕاسپاردانە، ئەشێ بە کۆی دەنگ حەکەمێکی بێلایەن دابنێن بۆ لێکۆڵینەوە و دانانی ڕاسپاردەکانی. لە حاڵەتێکا ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نەیانتوانی ڕێک بکەون لە سەر حەکەمێک، ئەشێ داوا لە سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتوەکان بکەن کەسێکی ناودەوڵەتی ناودار دابنێ تا ببێ بە حەکەم.»

دوا قۆناغی گفتوگۆکانی نوسینی قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق بۆ ماوەی گواستنەوە، لە نێوان نوێنەرانی کورد و عەرەب و ئەمەریکا، لە تاریکی دا و، لە پشتی خەڵکەوە ئەنجام دران، نوێنەرانی کورد لەو گفتوگۆیانەدا بۆ ڕازی کردنی ئەمەریکا و عەرەبی عیراق، دەستیان لە هەندێ بەرژەوەندی کورد شل کرد و، سێ یەکی ئەرزی کوردستانی عیراقیان خستە سەر «ڕێگای هات و نەهات»ی بازاڕی «ئیستیفتا» وە.

## ئێستا هاوڵاتیەکی کورد بۆی هەیە بپرسێ:

خواستە ئەرزیەکانی کورد چین و، ناوچە ناکۆکەکان کامانەن؟
سنوری کوردستانی عیراق کوێیە؟ لە کوێ دەس پێ ئەکا و لە کوێ دا تەواو ئەبێ.
لایەنی زۆر و لایەنی کەمی خواستە ئەرزیەکانی کورد چیە؟
کورد ئامادەیە واز لە کام ناوچەیە بهێنێ و ئامادە نیە واز لە کام ناوچە نەهێنێ؟
ئەم بابەتە چەند جار بە ئاشکرایان بە نهێنی لە لایەن سەرکردایەتی سیاسی کورد و کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی و پسپۆڕی جوغرافی کورد و غەیری کوردەوە باس کراوە؟
پرۆژەی سەرکردایەتی کورد بۆ ئەم مەسەلەیە چیە؟

پرۆژەی ئەم کارە کێ ئامادەی ئەکا: سەرکردایەتی حیزبیی کورد؟ سەرۆکەکانی کۆمار و هەرێم، ئەنجومەنەکانی وەزیران و، نیشتمانی...؟

**وەڵامی ئەم پرسیارانە لە کێ وەرئەگیرێتەوە؟**

مادەی ١٤٠: قۆناغەکانی جێبەجێ کردنی

یەکێ لە کێشە سەرەکیەکانی کورد لە گەڵ رژیمی بەعس گۆڕینی دیمۆگرافی ناوچە کوردستانیەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی عیراق بوە. حکومەتی عیراق لە سەردەمی پاشایەتیەوە، بە تایبەتی دوای دەرهێنانی نەوت لە کەرکوک، دەستی کردوە بە هێنانی عەرەب بۆ کوردستان، بەڵام ئەوەندە زیرەکانە و لە سەرەخۆ، لە دائیرەکانی حکومەت و کەرتەکانی نەوت و کشتوکاڵ دا ئەنجامی داوە سەرنجی هێزە سیاسیەکانی کوردی رانەکێشاوە تا بیکەنە بابەتێکی سیاسی. بەڵام لە١٩٦٣ ەوە کە بەعس هاتە سەر حوکم، حیزبی بەعس بە جۆرێکی سیستەماتیک کەوتە گۆڕینی دیمۆگرافی هەندێ لە شوێنە ستراتیجی و نەوتیەکانی کوردستان و، بە پێی پلانێکی داڕێژراو سنوری ئیداری ئەو شوێنانەی گۆڕی و نەخشەی تەرحیل و تەهجیر و تەعریبی جێبەجێ کرد.

**تەرحیل واتە راگوێزانی کورد لە ئەرزی خۆی بۆ شوێنی تر.**
**تەهجیر واتە دەرکردنی کوردی شیعە و فەیلی بە ناوی ئێرانی بونەوە بۆ دەرەوەی عیراق.**
**تەعریب واتە هێنانی کەس و خێزان و بنەماڵە و عەشیرەتی عەرەب بۆ سەر ئەرزی کوردستان.**

لە هەمو گفتوگۆکانی نوێنەرایەتی کورد و حکومەتەکانی عیراق دا هەر لە ١٩٦٣ بە دواوە تا روخانی بەعس لە ٢٠٠٣ دا و، دوای روخانی ئەویش لە گفتوگۆکانی سەردەمی مەجلیسی حوکم و نوسینی قانونی ئیدارەی دەوڵەت و نوسینی دەستوری هەمیشەیی دا ئەم گیروگرفتانە هەمو جار دوبارە بونەتەوە. لە قانونی ئیدارەی دەوڵەت دا مادەی ٥٨ و لە دەستوری هەمیشەیی دا مادەی ١٤٠ی بۆ تەرخان کراوە.

مادەی ٥٨ی قانونی ئیدارەی دەوڵەت ئەبو وەزارەتەکەی د ئیبراهیم جەعفەری جێبەجێی بکا، لە بەر ئەوەی لە کاتی خۆی دا جێبەجێ نەکرا و، نوسینی دەستوری بەسەردا هات، دەستوری هەمیشەیی جێبەجێ کردنی مادەی ٥٨ی تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ سپارد بە حکومەتی دوای هەڵبژاردن. وەکو لە مادەی ١٤٠ی دەستوردا نوسراوە:

«یەکەم — دەسەلاتی جێبەجێکردن ئەو هەنگاوە پێویستانە دەگرێتە بەر بۆ تەواوکردنی جێبەجێکردنی پێداویستەکانی مادەی ٥٨ بە هەمو برگەکانیەوە لەیاسای ئیدارەی دەوڵەتی عیراقی بۆ قۆناغی گواستنەوە.

دوەم — ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەویتە ئەستۆی دەسەلاتی جێبەجێکردن لە حکومەتی ئینتیقالیدا کە لە مادەی ٥٨ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عیراق دا بۆ قۆناغی گواستنەوە دەقنوسکراوە درێژ دەبێتەوە و بەردەوام دەبێت بۆ دەسەلاتی جێبەجێکردن کە بە پێی ئەم دەستورە هەڵبژێردراوە بۆ ئەوەی بە تەواوی ئەمانە ئەنجام بدەن (ئاسایی کردنەوە، سەرژمێری، کە کۆتایی دێت بە راپرسییەک لە کەرکوک و ئەو ناوچانەی دی کە کێشەیان لە سەرە بۆ دیاری کردنی ویستی هاولاتیانی) لە ماوەیەک دا کە لە (سی و یەکی) مانگی کانونییەکەمی ساڵی دو هەزار و حەوت تێپەڕ نەکات.»

بەم پێیە جێبەجێ کردنی مادەی ٥٨ کراوەتە ٣ قۆناغ: ئاساییکردنەوە، سەرژمێر، راپرسی. بۆ ئەوەی بچینە ناو تۆڕی ئاڵۆزاوی مادەی (٥٨)ەوە چاک وایە سەرلەنوێ دەقی مادەکە بخوێنینەوە:

## مادەی ٥٨ ئەڵێ:

«ئەلف. حکومەتی گواستنەوەی عیراق و، بە تایبەتی کۆمیسیۆنی عیراقی ناکۆکی موڵکداری و، دەزگا پەیوەندیدارەکانی تر، بە پەلە کار بکا بۆ دانانی رێوشوێنێ بۆ لابردنی بێدادی کە بە هۆی کرداری حکومەتی پێشوەوە بۆ گۆرینی پێکهاتەی دیمۆگرافی هەندێ ناوچەی دیاریکراو، لەوانە کەرکوک، بە راگوێزان و دورخستنەوەی کەسان لە شوێنی نیشتەجێ بونیان، کۆچاندنی بە زۆر بۆ ناو و دەرەوەی ناوچەکە، نیشتەجێ کردنی کەسانی نامۆ لە ناوچەکەدا، بێ بەش کردنی دانیشتوانی لە کار و، راستکردنەوەی نەتەوەییان. بۆ چارەکردنی ئەم بێدادیە، حکومەتی گواستنەوەی عیراق ئەبێ ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێ:

یەکەم- سەبارەت بەو دانیشتوانەی راگوێزراون، دور خراونەتەوە،یان کۆچیان پێ کراوە، ئەبێ، بە پێی نیزامی کۆمیسیۆنی عیراقی ناکۆکی موڵکداری و، رێوشوێنی تر لە چوارچێوەی قانون دا، لە ماوەیەکی مەعقول دا، دانیشتوەکان بگێرێتەوە بۆ ناو ماڵ و موڵکی خۆیان، یان، ئەگەر ئەوە نەتوانرا، ئەبێ بژاردنێکی رەوایان بداتێ.

دوەم- سەبارەت بەو کەسانەی تازە براونەتە ناوچە و شوێنی دیاریکراو، ئەبێ بە پێی مادەی ١٠ی نیزامی کۆمیسیۆنی عیراقی ناکۆکی موڵکداری، بۆ دابینکردنی نیشتەجێ کردنەوەیان، وەرگرتنی بژاردن لە دەوڵەت،یا پێدانی زەوی تازەی دەوڵەتی لە نزیک شوێنی نیشتەجێ کردنیان لەو پارێزگایەی لێوەی هاتون،یان بژاردنی تێچونی جولاندنیان

بۆ ئەو جۆرەشوێنانە.

سێیەم- سەبارەت بەو کەسانەی بێ بەش کراون لە فەرمانبەرییا هۆی تری پشتیوانی بە مەبەستی کۆچاندنی زۆرملێ بۆ دەرەوەی ناوچە و شوێنەکانیان، ئەبێ هەلی نوێی فەرمانبەرییان لەو ناوچە و شوێنانەدا بۆ برەخسێنێ.

چوارەم- سەبارەت بە راستکردنەوەی نەتەوەیی، ئەبێ هەمو بڕیارە پەیوەندیدارەکان هەڵبوەشێنرێتەوە و ئەبێ رێ بدرێ بەو کەسانەی دوچاری بون مافی بڕیاردانی ناسنامەی نەتەوەیی و رەگەزی خۆیان هەبێ بە ئازادی بێ زۆر لێ کردن و ناچار کردن.

ب. رژێمی پێشویاری بە سنوری کارگێڕی کردوە بۆ مەبەستی سیاسی گۆڕیوێتی. ئەنجومەنی سەرۆکایەتی حکومەتی گواستنەوەی عیراق چەند راسپاردەیەک ئەدا بە کۆمەڵەی نیشتمانی بۆ چارەکردنی ئەم گۆڕینە ناڕەوایانە لە دەستوری دائیمیدا. لە حالەتێکا کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بە کۆی دەنگ نەیانتوانی رێک بکەون لە سەر دانانی ئەو راسپاردانە، ئەشێ بە کۆی دەنگ حەکەمێکی بێلایەن دابنێن بۆ لێکۆڵینەوە و دانانی راسپاردەکانی. لە حاڵەتێکا ئەنجومەنی سەرۆکایەتی نەیانتوانی رێک بکەون لە سەر حەکەمێک، ئەشێ داوا لە سکرتێری گشتی نەتەوەیەکگرتوەکان بکەن کەسێکی ناودەوڵەتی ناودار دابنێ تا ببێ بە حەکەم.

ج. بڕیاری هەمیشەیی ناوچە ناکۆکەکان، لەوانە کەرکوک، دوا ئەخرێ تا تەواو بونی ئەم رێوشوێنانە، ئەنجامدانی سەرژمێرێکی پاک و رون و پەسند کردنی دەستوری دائیمی. ئەو بڕیارەش ئەبێ لە گەڵ سەرەتای رەوایەتیدا بگونجێ، ویستی دانیشتوانی ئەو شوێنانە لە بەر چاو بگیرێ.»

## مادەی ١٤٠: هەر ٣ قۆناغەکەی جێبەجێ کردنی

مادەی ١٤٠ جێبەجێ کردنی مادەی ٥٨ی کردۆتە ٣ قۆناغ، بەڵام چوارچێوەی میکانیزمی جێبەجێ کردنی قۆناغەکانی، بێ ئەوەی بچێتە ناو وردەکاریەکانیەوە، هەر ئەوەیە کە لە مادەی ٥٨ دا باس کراوە. ئەبوایە کورد، راستەوخۆ لە دوای دەرچونی قانونی ئیدارەی دەوڵەتەوە، خۆی پرۆژەی وردەکاریەکانی هەر ٣ قۆناغەکەی دابنایە وەکو لێرەدا، لە باری سەرنجی خۆمەوە، هەندێ سەرە قەڵەمی لێ ئەنوسم.

### قۆناغی یەکەم: ئاساییکردنەوە

ئاساییکردنەوە، وەکو کورد تێی ئەگا بریتیە لە سڕینەوەی شوێنەوارەکانی تەرحیل و

تەهجیر و تەعریب. وەکو لە دەقی مادەکەش دەرئەهێنرێ دو بواری سەرەکی ئەگرێتەوە:
یەکەم، راستکردنەوەی باری دیمۆگرافی. دوەم، راستکردنەوەی سنوری کارگێڕی.

بواری یەکەم، گێڕانەوەی هاوردە و راگوێزراو بۆ شوێنەکانی پێشویان.

هاوردە ئەو عەرەبانەن کە لە ناوچە عەرەبیەکانەوە هێنراون لە جێگەی کورد لە کوردستان نیشتەجێ کراون و، راگوێزراو ئەو کورد و تورکمانانەن کە لە شوێنەکانی خۆیان دەرکراون.

عەرەبی هاوردە و کورد وتورکمانی دەرکراو بگەڕێنرێنەوە شوێنەکانی پێشویان. هەردو لایان قەرەبو بکرێن. زەوی نیشتەجێ بونیان کشتوکاڵیان بدرێتێ، کاریان بۆ بدۆزرێتەوە.

عەرەبی هاوردە کێیە، چۆن ئەگەڕێنرێتەوە شوێنەکەی پێشوی، هەندێ لەمانە لە ١٩٦٣ وە نیشتەجێ کراون، ئەوانەی لەو ناوچانەدا لە دایک بون جێگیربون و جگە لە شوێنی تازەیان جێگەیەکی تر بە وڵاتی خۆیان نازانن.

رێگە ئەدرێ لە شوێنی ئێستایان بمێننەوە، ئەگەر رێگە ئەدرێت بە چ شەرت و مەرجێ، لە کام راپرسی و لە کام هەڵبژاردن دا مافی دەنگدانیان هەیە؟

ئەگەر بگەڕێنەوە شوێنەکانی پێشویان بۆ ئەوەی ژیانێکی تازە دەس پێ بکەن ئەبێ حکومەت چیان بۆ بکات؟

چەند پارەی نەختینەیان بدرێتێ؟

خانو و زەوی و زاری ئێستایان چی لێ ئەکرێ؟

لە شوێنی پیشویان شوێنی نیشتە جێ بون، خزمەتگوزاری پێویست، هەلی کارکردنیان چۆن بۆ دابین ئەکرێ؟

کوردی دەرکراو کێیە؟

ئەو کوردانەی بەهۆی تەعریب و تەرحیل و تەهجیر... دەربەدەر بون، بڵاو بونەتەوە بە سەرانسەری کوردستانی عیراق و بە سەرانسەری عیراق و بە سەرانسەری دنیادا؟ ئەمانە هەندێکیان تا ئێستەش خۆیان بە ئاوارە ئەزانن و، هەندێکیان جێگیر بون لە شوێنانی تر. ئەمانە چۆن ئەگەڕێنەوەیا ئەگەڕێنرێنەوە بۆ شوێنەکانی پێشویان؟

بۆ ئەوەی ژیانێکی تازە دەس پێ بکەن چیان بۆ ئەکرێ لە پارەی نەختینە، جێگەی نیشتەجێبون، خزمەتگوزاری پێویست، هەلی کارکردن؟

حکومەتی عیراق پرۆژەی چی بوە بۆ ئەم کێشەیەو، پرۆژەی کورد، کە خۆی بە خاوەنی کێشەکە ئەزانێ، بۆ چارەسەری ئەم کێشە کوردیـ عەرەبی‌یە چی بوە؟

## وەڵامی ئەم پرسیارانە لە کێ وەرئەگیرێتەوە؟

دوەم: راستکردنەوەی سنوری کارگێڕی

بەعس کە هاتە سەر حوکم گۆڕینی زۆری لە سنوری کارگێڕی هەندێ لە پارێزگاکانی عیراق دا کردوە، تەنانەت هەندێ زاراوەی کارگێڕیشی گۆڕی. بەر لەوەی بەعس لە ١٩٦٣ دا بێتە سەر حوکم لە بری زاراوەی «پاریزگا» زاراوەی «لیوا» بە کار ئەهێنراو لە باتی «پارێزگار» وشەی «موتەسەریف» بە کار ئەهات.

رژێمی بەعس دەسکاری سنوری کارگێڕی پارێزگاکانی کردوە و هەندێ قەزا و ناحیە و ناوچەی دابڕیوە لە هەندێ پاریزگا و خستویەتیە سەر پارێزگایەکی تریا پارێزگای تازەی لێ دروست کردوە، هۆی ئەم گۆڕینەش ئەگەڕێتەوە بۆ مەسەلەی سیاسی و ئەمنی، نەک مەسەلەییەکپارچەیی جوگرافی و قازانجی ئابوری- کشتوکاڵی، ئاودێری، پیشەسازی... ئەو ناوچانە. لەبەر ئەوە ئەمە بۆتە هۆی دروستکردنی کێشەی دیمۆگرافی، کێشەی نەتەوەیی، کێشەی دینی و مەزەبی،..

ئەگەر کورد لە مەسەلەی گۆڕینی سنوری کارگێڕی دا خۆی بە زوڵم لێکراو بزانێ، ئەوا شیعەش بە هەمان شێوە خۆی بە زوڵم لێ کراو ئەزانێ چونکە ئەنبار (رومادی) لەسەر حسابی زەوی نەجەف و کەربەلا فراوان کراوە و، سەلاحەدین (تکریت) لە سەر حسابی بەغداد و کەرکوک دروست کراوە. ئەگەر بویستری ئەم سنورانە راست بکرێنەوە لە سەر چ بنەمایەک و چی ئەکرێ بە پێوانە؟

مادەی ٥٨ میکانیزمێکی بۆ جێبەجێ کردنی مادەکە داناوە پێ ئەچێ هەرگیز لە کردن نەیەت ئەویش ئەوەیە کە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ئەبێ بە کۆی دەنگ لە سەر چەند راسپاردەیەک پێک بێن بۆ جۆری راستکردنەوەی ئەو سنورە کارگێڕیانەی بەعس بۆ مەبەستی سیاسییاری پێ کردون. ئەم ئەنجومەنەی کە پێک هاتوە لە ٣ کەس:

کوردێک و عەرەبێکی سوننە و عەرەبێکی شیعە و، لە ناو ئەم ٣ لایەنەدا سوننە سودمەندی گەورە بوە و لە هەر ئاڵوگۆڕێکی سنوری کارگێڕی دا سوننە زەرەرمەندی گەورە ئەبێ، کەواتە چۆن ئەگەنە تێگەیشتنێکی هاوبەش لە سەر «ناوچە ناکۆکەکان».

بێگومان ئەگەر مەحاڵ نەبێ کارێکی زۆر دژوارە بگەنە راسپاردەی هاوبەش ئەوسا ئەبێ «حەکەمێکی بێلایەن» بکەن بە سەرپشک، ئەگەر ئەمیش کێشە ئەرزیەکانی پێ چارەسەر نەکرا داوا لە سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان بکەن «حەکەم» دابنێ و کێشەکان بە لادا بخا.

لێرەدا چەندین پرسیار دێتە پێشەوە:

سەرکردایەتی کورد بۆچی قبوڵی کردوە بەم پەیژە لەرزۆکەدا سەر بکەوێ؟

ئایا ئەنجومەنی وەزیران و ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان، وەزیرەکانی و فراکسیۆنە پارلەمانیەکەی لە بەغداد...
بیریان لەم حەواڵە بە گەواڵەیە کردۆتەوە؟
خۆ ئەگەر بیریان لێ کردۆتەوە، چ لێکۆڵینەوەیەکی قانونی و سیاسی‌یان بۆئەم کێشە سەختە ئامادە کردوە و چەند پرۆژەی حساب کراو و چەند سیناریۆی جیا جیایان داناوە بۆ ئەوەی لەم کەینوبەینەدا کورد توشی زەرەر نەبێ بەڵکو سەرزەمینی مێژویی خۆی کە چەندین ساڵە شەڕی لەسەر ئەکا بگێڕێتەوە بۆ باوەشی دایکی نیشتمان؟
لێرەدا بیرهێنانەوەی دو پرسی تری گرنگ پێویستە:
یەکەمیان، بە پێی مادەی ١٤٠ ئەبو تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ ئەمە جێبەجێ بکرایە، بۆ نەکراوە و کێ بەرپرسە لە جێبەجێ نەکردنی؟
**دوەمیان،** لیستی هاوپەیمانیی کوردستان کە هاوبەشی کرد لە دامەزراندنی وەزارەتەکەی نوری مالیکی دا، بەشداری کردن و مانەوەی لە وەزارەت دا گرێ دابو بە جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠ەوە بە پێی زەمانبەندیەکی دیاریکراو کە ئەبو: لە ٣ مانگییەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ دا پرۆسەی ئاساییکردنەوە، لە هەردو بواری راستکردنەوەی باری دیمۆگرافی و راستکردنەوەی سنوری کارگێڕی دا، تەواو ببێ.
ئەم زەمانبەندیە پێڕەوی نەکراوە، ساڵی ٢٠٠٧ بەرەو کۆتایی ئەڕوا، کێ بەرپرسە لە جێبەجێ نەکردنی ئەم زەمانبەندیە و بۆچی سەرکردایەتی کورد هەڵوێستێکی بەرامبەر ئەم کەمتەرخەمیە، ئەگەر کەمتەرخەمی کرابێ، نەنواند؟
وەڵامی ئەم پرسیارانە لە کێ وەرئەگیرێتەوە؟

## قۆناغی دوەم: سەرژمێر

لە عیراق دا چەند جارێ سەرژمێر کراوە، بەڵکو ئامار کراوە بەڵام هەرگیز حکومەتی عیراق رێگەی نەداوە ئەنجامەکانی سەرژمێریەکە بە رونی و بە راستی و بە ئاشکرا بڵاوبکرێتەوە. لەبەر ئەوە ژمارەی راستەقینەی دانیشتوانی عیراق، ژمارەی پێکهاتەی نەتەوەیی و دینی و مەزەبیەکانی و، هەمو زانیاریە گرنگە پەیوەندیدارەکانی ئەو بابەتانە لە ژێر ناوی (ئاسایشی نیشتمانی) دا بە نهێنی هێڵڕاونەتەوە، بەعس بۆ مەبەستی خۆی، بە تایبەتی سیاسی و ئەمنی، بە کاری هێناون.

دوای روخانی سەدام ئەکرا سەرژمێری دانیشتوان ئەنجام بدرێ و ئەنجامدانی ئامارگیری گشتی دوا بخرایە.
داوودەزگاکانی وەزارەتی پلاندانان و فەرمانگەکانی ئامار بەهاوکاری نەتەوەیەکگرتوەکان

ئەیانتوانی لە ماوەی چەند مانگێکدا ئەنجامی بدەن، تەنانەت لەسەردەمی مەجلیسی حوکم دا بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردن و بەشێ هەریەکێ لە پێکهاتەکانی دانیشتوانی عیراق لە کاروباری حوکمڕانی دا، هەندێ لایەن بروبیانویان ئەهێنایەوە بۆ نەبونی توانای ئەنجامدانی ئامار و، هەندێ لە کاربەدەستانی نەتەوەیەکگرتوەکانیشیان بەوە فریو دابو، کارمەندانی فەرمانگەی ئاماری سلێمانی چونە بەغداد و لە گفتوگۆیەکی زانستی چەند رۆژەدا کاربەدەستانی نەتەوەیەکگرتوەکانیان ئیقناع کرد بە توانینی ئەنجامدانی، بەڵام شیعە کە ئەو زەمانە لە راگەیاندنەکان دا، بە تایبەتی لە راگەیاندنی ئەمەریکی و ئینگلیزی دا، بەندوباوی ئەوە بڵاو بو کە شیعە ٦٥٪ی دانیشتوانی عیراق پێک ئەهێنن و، سەرانی شیعە خۆیشیان لەو رێژەیە دڵنیا نەبون بۆیە نەیان ئەویست تا هەڵبژاردنەکان ئەکرێ و پایە سەروەریەکانی دەوڵەت و وەزارەتەکانی حکومەت و کورسیەکانی پارلەمان دابەش ئەکرێ و دەستور ئەنوسرێ، بۆ ئەوەی رێژەی راستەقینەی شیعە و سوننە و کورد و تورکمان و مەسیحی ئاشکرا نەبێ، سەرژمێر نەکرێ و سود لەو بەندو باوە وەربگرن، کە سوننە بە رێژەیەکی ناڕاست و دروستکراویان ئەزانی.

مادەی ٥٨ برگەی یەکلایی کردنەوەی چارەنوسی «ناوچە ناکۆکەکان»ی بەستوە بە ئەنجامدانی «سەرژمێرێکی پاک و رون..»ەوە.

بەڵام ئەم سەرژمێرە، کە ئەبێ پاک و رون بێ، کێ ئەنجامی ئەدا: دامەزراوەیەکی بێلایەن وەکو نەتەوەیەکگرتوەکان یا وەزارەتی پلاندانانی عیراق؟

کێ پێوانەکانی سەرژمێری ساخ ئەکاتەوە و لە سەر چ بنەمایەک سەرژمێری دانیشتوانی ئەو ناوچانە ئەکرێ: ئامارە کۆنەکانی عیراق؟ ئاماری تازە؟ دانیشتوانی ئێستا؟ هاوردەکان، بە تایبەتی ئەوانەی نەگەڕاونەتەوە، ئەخرێنە چ خانەیەکەوە؟

ئاخۆ دەرکراوەکانی کە بە سەرانسەری کوردستان و عیراق و دنیادا بڵاو بونەتەوە سەرژمێر ئەکرێن. ئەگەر ئەکرێ چۆن سەرژمێر ئەکرێن؟

دەوری کورد و داوودەزگاکانی هەرێمی کوردستان لەو سەرژمێرەدا چی ئەبێ؟

ئەبوایە بۆ هەمو ئەو هەنگاوانە پرۆژەی حسابکراو دابنرایە.

ئەمانە ئیشی کێ بون؟ ئەبو کێ بیکردایە؟

لیستی هاوپەیمانی، کە هەمیشە وەزارەتەکەی جەعفەری و پێش ئەو عەلاوییان، تۆمەتبار ئەکرد بە کەمتەرخەمی، بۆ ئەوەی رێ لە حکومەتی تازە ببڕن زەمانبەندییان دانا بۆ جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠ کە لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ تێنەپەڕێ و، لیستی هاوپەیمانیی کوردستان وەکو مەرجی بەشداری کورد و مانەوەیان لە وەزارەتەکەی مالیکی دا ئەو زەمانبەندیەیان ورد کردەوە کە ئەبو لە ٣ مانگی دوەمی ساڵی ٢٠٠٧ دا قۆناغی دوەمی مادەی ١٤٠ کە «پرۆسەی سەرژمێر» بو ئەبو لە «ناوچە ناکۆکەکان»

دا ئەنجام بدرایە.
وا ساڵێ ٢٠٠٧ بەرەو کۆتایی ئەچێ و، ماوەی ئەنجامدانی پرۆسەی سەرژمێر تێ پەڕیوە و، ئەو زەمانبەندیەی لیستی هاوپەیمانیی کوردستان بۆ وەزارەتەکەی مالیکییان دانا بو پێڕەوی نەکراوە. بۆچی سەرکردایەتی کورد لەو بارەیەوە هیچ هەڵوێستێکی نەنواند؟

## وەڵامی ئەم پرسیارانە لە کێ وەرئەگیرێتەوە؟

### قۆناغی سێیەم: راپرسی

وەکو مادەی ١٤٠ برگەی دوەم نوسیوێتی: ئاسایی کردنەوە، سەرژمێری، کە کۆتایی دێت بە راپرسیەک کە لە کەرکوک و ئەو ناوچانەی دی کە کێشەیان لە سەرە بۆ دیاری کردنی ویستی هاوڵاتیانی.
لە سەرەتاوە ئەبێ دان بەوەدا بنێین کە قبوڵکردنی سەرەتای راپرسی بۆ یەکلایی کردنەوەی چارەنوسی هەمو ناوچە کوردنشینەکانی دەرەوەی هەرێمی کوردستان و ناوبردنیان بە ناوچەکانی ناکۆکی، هەڵەیەکی سیاسی- مێژویی بوە کراوە، هەر کەس و هەر چەند کەس و هەر لایەن و هەر چەن لایەن، لێی مەسول بن، لە ژێر هەر گوشار و لە ناو هەر هەلومەرجێک دا بوبێ، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێ، چونکە هیچ گەلێ بۆ سەندنەوەی پارچەیەک لە نیشتمانەکەی راپرسی قبوڵ ناکا.
ئەگەر گۆڕینێ لە دەستوری دائیمی عیراق دا بکرێ، وەکو عەرەبی سوننە و هەندێ لە عەرەبی شیعە ئەیانەوێ، پێویستە کوردیش داوای لابردنی ئەم سەرەتا ناڕەوایە بکا و، ئەوسا بێ راپرسی داوای ناوچە کوردستانیەکانی دەرەوەی سنوری ئێستای هەرێمی کوردستان بکا.
راپرسیەکەش دیار نیە چۆن ئەنجام ئەدرێ.
ڕاپرسی چۆن بکرێ لەسەر ناوچە ناکۆکەکان: گوند بە گوند، ناحیە بە ناحیە، قەزا بە قەزا، محافەزە بە محافەزە؟
چەند بەشێکی نیشتمانی کورد کەوتۆتە سنوری ئێستای نەینەوا (موسل) لەوانە: شێخان، مەخمور، سنجار و، چەند بەشێکیشی کەوتۆتە سنوری ئێستای دیالە (باقوبە) لەوانە: خانەقین، سەعدیە، جەلەولا و، چەند بەشێکی کەوتۆتە سنوری ئێستەی سەلاحەدینەوە (تکریت) لەوانە: توزخورماتو و، چەند بەشێکیشی کەوتۆتە سنوری ئێستای (میسانیان واسیت) لەوانە: مەندەلی، بەدرە..
ئەگەر راپرسی لەسەر ئاستی پارێزگا بکرێ وەکو هەندێ کورد ئەیانەوێ لە کەرکوک

ئەنجام بدرێ (دوای گێڕانەوەی بۆ سنوری ئیداری١٩٦٨)، ئەوا لە موسل: مەخمور، شێخان، شەنگار و، لە دیالە: خانەقین و سەعدیە و جەلەولا و، لە سەلاحەدین: توزخورماتو و، لە واسیت : مەندەلی و بەدرە ئەدۆرێ لە بەر هۆیەکی ئاسان، چونکە زۆرایەتی ئەو پارێزگایانە عەرەبن و، ئەو ناوچە کوردیانە قورساییەکی دیموگرافییان نیە لە چاو تێکرای دانیشتوانی عەرەبی پارێزگاکەدا.

ئەگەر راپرسی لە سەر ئاستی قەزا بکرێ وەکو هەندێ پێشنیار ئەکا ئەوا کەرکوک کە ئێستە چاوی هەمو لایەکی لەسەرە هەروەها دوز لە دۆڕانەوە نزیکترە تا بردنەوە.

سەرکردایەتی کورد چی کردوە بۆ دابینکردنی ئەنجامی راپرسی لەو ناوچانەدا؟

چ پرۆژەیەکی هەبو بۆ گێڕانەوەی کورد بۆ شوێنەکانی خۆی؟

چ پرۆژەیەکی سیاسی، قانونی، ئاوەدانکردنەوەی هەبوە بۆ راکێشانی تورکمان و عەرەب و مەسیحی وشەبەک ویەزیدی لەو ناوچانەدا؟

کێ لەو راپرسیەدا مافی دەنگدانی هەیە؟

**هەمو ئەوانەی ئێستە لەوێ دانیشتونیا ئەوانەی لەسەرژمێرەکانی ١٩٤٧ و ١٩٥٧یان ١٩٦٧ و ١٩٧٧ دا لەوێ نیشتەجێ بون.**

ئەوانەی لە دوایین هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگا و ئەنجومەنی نوێنەران دا دەنگیان داوە؟

کێ سەرپەرشتیی ئەنجامدانی پرۆسەی راپرسی و دەرهێنانی ئەنجامەکەی و جێبەجێ کردنی ئەنجامەکەی ئەکا؟

حکومەتی عیراقیان دامەزراوەیەکی بێلایەن.

## وەڵامی ئەم پرسیارانە لە کێ وەرئەگیرێتەوە؟

## دوا قسە:

## لە کێ بپرسین هەواڵی راستی

بەیکەر — هامیلتۆن لە راپۆرتە بە ناوبانگەکەیان دا دو جار و لە دو راسپاردەیان دا باسی کەرکوکیان کردوە. راسپاردەی ژمارە ١ی راپۆرتەکەی بەیکەر — هامیلتۆن دەربارەی دەس پێکردنی هەڵمەتێکی دیپلۆماسی نوێیە و، یەکێ لە مەبەستەکانی ئەم هەڵمەتە وەکو لە برگەی ٩ی راسپاردەی ژمارە ٢ دا رونیان کردۆتەوە: «یارمەتی دانی

عیراقە بۆ ئەوەی بگاتە ڕێککەوتنێکی قبوڵکراو لە سەر کەرکوک.»

ڕاسپاردەی ژمارە ٣٠ی ڕاپۆرتی گۆڕین تەرخان کراوە بۆ کەرکوک، بە ئاشکرا ئەڵێ:
«لە بەرئەوەی دۆخی کەرکوک زۆر مەترسیدارە، ناوبژیوانی ناودەوڵەتی زۆر پێویستە بۆ خۆ لادان لە توندوتیژی ناو خەڵک. دانیشتوانی کەرکوک تێکەڵە لە کورد، عەرەب و تورکمان، وەکو بەرمیلی باروت وایە. ریفراندۆم لە سەر پاشەڕۆژی کەرکوک (وەکو لە دەستوری عیراق دا داوا کراوە پێش کۆتایی ٢٠٠٧ بکرێ) **ئەبێتە هۆی تەقینەوە بۆیە ئەبێ دوا بخرێ.**

ئەم بابەتە پێویستە بخرێتە سەر ئەجێندای گروپی پشتیوانیی ناودەوڵەتی عیراق وەکو بەشێ لە هەڵمەتی دیپلۆماسی نوێ.»

پێ ئەچێ سەرەنجام ئەم ڕاسپاردەیە جێبەجێ بکرێ!

# کێشەی نەوت: لە نێوان حکومەتی ناوەندی و حکومەتی هەرێم دا ★

لە دوای روخانی رژێمی بەعسەوە هەمو پرسە چارەنوسیەکانی عیراق سەرلەنوێ هاتونەتەوە سەر دەزگای باس و پێداچونەوە. زۆری ئەو پرسانە پێشتر لە قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق و دوای ئەو لە دەستوری هەمیشەیی عیراق دا رەنگیان داوەتەوە.یەکێ لەو پرسە چارەنوسی‌یانە کێشەی نەوتە.

ئەگەر سەردەمێ، یا رۆژێ لە رۆژان، ئابوری عیراق فرە بەرهەم و داهات و دەرامەتی فرە سەرچاوە بوبێ، ئەوا لە سەردەمی سەدام حسێن دا، بە تایبەتی لە ساڵانی جەنگەکانی دا، بۆتە وڵاتێکی تاک بەرهەم و تاک سەرچاوەی دارایی، کە ئەویش نەوتە.

لە دوای روخانی رژێمی بەعسەوە، لە سەردەمی مەجلیسی حوکم و دوای ئەو لە سەردەمی وەزارەتەکانی د. ئەیاد عەلاوی، د. ئیبراهیم جەعفەری و، نوری مالیکی، کە جۆرێ لە رۆشنایی لە بودجەی عیراق دا دروستبوە ئەم راستیە دەرئەکەوێ کە نەوت بۆتە سەرچاوەی سەرەکی بودجەی عیراق، هەر لە بودجەی ساڵی ٢٠٠٣ەوە تا دوایین بودجە کە بودجەی ساڵی ٢٠٠٨ە.

هەندێ جار داهاتی نەوت ٩٦٪ی بودجەی عیراقی داپۆشیوە.

داهاتی بودجەی ساڵی ٢٠٠٨ی عیراق خەمڵێنراوە بە ٥٠ تریلیۆن و ٧٧٧ ملیار و ٨١ ملیۆن دینار لەوە سەروی ٤٥ تریلیۆن و ١٨٠ ملیاری لە فرۆشتنی نەوت دابین ئەکرێ. بۆیە نەوت لە قۆناغی ئیستادا بۆتە فاکتەرێکی گرنگ لە بریاردانی چارەنوسی عیراق دا. هەر لەبەر ئەوەش بو کە لە کاتی پەلاماردانی عیراق دا تەنیا جێگەی ئەمەریکا پاراستی وەزارەتی

---

★ سایتی سبەی ٢٨/١١/٢٠٠٧

رۆژنامەی رۆژنامە ١٠٨ لە ٢٨/١١/٢٠٠٧

نەوت و دامەزراوەکانی نەوت بو، تەنیا کەرتی ئابوریش کە ئەمەریکا دوای داگیرکردنی عیراق بایەخی پێدا کەرتی نەوت بو.

* ساڵی ١٩٧٢ مەجلیسی قیادەی سەورە لە عیراق بە سەرکردایەتی سەدام حسێن نەوتی عیراقی بە سەرمایە و داودەزگاکانیەوە «تەئمیم» کرد و، هەمو بوارەکانی نەوت و قۆناغەکانی دەرهێنان و فرۆشتنی کردە مۆنۆپۆڵ و موڵکی دەوڵەت. لەوەتی ئەمەریکا هاتۆتە عیراقەوە کێشەی نەوت، وەکو زۆر پرسی چارەنوسسازی تر، بۆتە پرسی رۆژ، عیراق بە داهاتی نەوت بەرێوە ئەچێ. بۆ رەفتار لە گەڵ پرسی نەوت دو بۆچونی سەرەکی هەبوە، کە تا ئێستاشیەکلایی نەبۆتەوە:

## بۆچونی یەکەم:

مانەوەی نەوت، لە هەمو قۆناغەکانی دا — دۆزینەوەی، هەڵێنجانی، فرۆشتنی، دابەشکرنی داهاتی- بە دەس حکومەتی ناوەندیەوە لە بەغداد.

بەیکەر — هامیلتۆن لە راپۆرتەکەیان دا بەشێکی تایبەتییان بۆ تەرخان کردوە و، چەند جارێ باسی نەوتیان کردوە و، لە دو راسپاردەدا رای خۆیان بە ئاشکرا نوسیوە:

راسپاردەی ژمارە ٢٣: داوا ئەکا تا کۆتایی ٢٠٠٦ و سەرەتای ٢٠٠٧ قانونی نەوت لە عیراق دەربچێ.

راسپاردەی ٢٨ ئەڵێ: دابەشکردنی داهاتی نەوت، ئەبێ دەرامەتی نەوت بروات بۆ حکومەتی ناوەندی و بە سەر دانیشتوان دا دابەشبکرێ. نابێ کۆنترۆڵی داهاتی نەوت لەو کێڵگانەدا کە لە پاشەرۆژدا ئەدۆزرێنەوە بدرێتە دەس هەرێمەکان،یا کۆنترۆڵی کێڵگەکانی نەوت بدرێتە دەس هەرێمەکان مەگەر بە سازان و هاوکات بێ لە گەڵ ئاشتبونەوەی نیشتمانی»

ئەم بۆچونە هی ئەمەریکیەکانە هەر لە سەردەمی دەسەڵاتی حاکمی مەدەنی عیراق پۆل بریمەرەوە تا سەردەمی سەفیر زاڵمای خەلیلزاد و دوای ئەو سەفیر راین کرۆکەر. هەوڵی سەپاندنیان داوە لە بەرگێکی قانونی دا. بیانویشیان بۆ ئەم بۆچونە ئەوەیە کە نەوت فاکتەری مانەوەی ئەرز و گەل و دەوڵەتی عیراقە بەیەکگرتویی.

عەرەبی سوننە پشتیوانی لەم بۆچونە ئەکەن. جگە لەوەی زۆرایەتی عەرەبی سوننە لە گەڵ دامەزراندنەوەی عیراقێکی ناوەندیی بە هێزن، کە سەرلەنوێ دەسەڵاتی سیاسی، ئابوری، جەنگی لە دەستی حکومەتێکی ناوەندی بەهێزدا کۆ بکرێتەوە، مەترسی ئەوەیان هەیە ئەگەر رەفتار لە گەڵ پرسی نەوت بکەوێتە دەس هەرێمەکان، ئەوان بێبەش بکرێن لە داهاتی نەوت چونکە تا ئێستا مەیدانی نەوتی دۆزراوە و دامەزراوەی دەرهێنانی نەوت لە ناوچەکانی ئەوان دا نیە.

جگە لە سوننەی عەرەب، هەندێ لە شیعەکانی عەرەب بە بیانوی دابین کردنی دادپەروەری

له دابەشکردنی داهاتی سامانی سروشتی عیراق دا لایەنگری ئەم بۆچونەن، ئەوانەش بە تەمان لە رێی کۆنترۆڵی نەوتەوە کۆنترۆڵی هەمو عیراق بکەن بە شیعە و سوننە و کوردەوە.

هەندێ کوردیش پشتیوانی لەم بۆچونە ئەکەن بە بیانوی ئەوەی نەوتی کوردستان لە چاو نەوتی عیراق دا کەمە، لە باتی ئەوەی کورد بەو نەختە نەوتەی خۆی دابکەوێ باشترە بەشدار بێ لە نەوتی مشەی عیراق دا. ئەمەش بیانویەکە، زۆرتر لەوەی پشت ئەستور بێ بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی، بۆ هاوئاوازیە لەگەڵ سیاسەتی نەوتی ئەمەریکیەکان.

## بۆچونی دوەم:

مانەوەی هەمو مەیدانەکانی کە ئیستا نەوتیان لێ دەرئەهێنرێ بە هەمو دامەزراوەکانیەوە لە دەس حکومەتی ناوەندی بەغدادا، بەو مەرجەی داهاتەکەی بە پێی ژمارەی دانیشتوان و پێویستی ئەو ناوچانەی لە سەردەمی بەعس دا زەرەری زۆرتریان لێ کەوتوەیا زۆرتر پێویستیان بە گەشە پێدانە، لە پاڵ ئەم دەسەڵاتە ناوەندیەدا سەلماندنی مافی هەرێمەکان بۆ دۆزینەوەی مەیدانی نوێ و هەڵێنجان و فرۆشتنی.

ئەم بۆچونە بە رادەییەکەم لە لایەن کوردەوە داکۆکی لێ کراوە بە تایبەتی، چونکە تەجروبەی کورد لە گەڵ حکومەتی ناوەندی بەغداد لە بواری نەوت دایەکجار تاڵ و خوێناویە. هەمو ناوچە نەوتیەکانی کوردستان کەوتونەتە بەر شاڵاوی تەهجیر و تەعریب و، هەمو دامەزراوە نەوتیەکانی عیراق لە کورد بژار کراون.

لە ساڵی ١٩٢٧ ەوە نەوت لە کوردستان دەرئەهێنرێ. حکومەتی ناوەندی بەغداد نەک هیچ بەشێکی داهاتی نەوتی بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و باشکردنی ئاستی گوزەرانی خەڵک و بنیاتنانی ژێرخانی ئابوری بە کار نەهێناوە، بەڵکو بە دەرامەتی نەوت گەورەتری مەکینەی جەنگیی دروست کردوە، کوردستانی پێ وێران و کوردی پێ قڕ کردوە.

* لە رۆژانی نوسینی دەستوری هەمیشەیی عیراق دا پرسی نەوت ناکۆکیەکی دژوار بو لە نێوان لایەنی کوردی لە لایەک و لایەنی عەرەبی و ئەمەریکی لە لایەکی ترەوە. سەرەنجام چەند مادەیەک بە نیوەوناچڵ لە ژێر گوشاری لایەنی کوردی دا سەبارەت بە نەوت و غاز خرایە دەستورەوە.

مادەی ١١١: نەوت و گاز موڵکی هەمو گەلی عیراقە لە هەمو هەرێم و پارێزگاکان دا.

مادەی (١١٢):

یەکەم حکومەتی فیدراڵ هەڵدەستێت بە بەرێوەبردنی نەوت و گازی دەرهێنراو لە کێڵگەکانی ئێستادا لەگەل حکومەتی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکاندا بە مەرجێ داهاتەکانی دادپەروەرانە دابەش بکرێت، کە بگونجیت لەگەڵ دابەش بونی دانیشتوان لە هەمو ناوچەکانی وڵاتدا و لەگەڵ دیاری کردنی بەشێک بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بۆ هەرێمە زیان لێ کەوتوەکان

که له لایەن ڕژێمی پێشوەوە بە شێوەیەکی بێ دادی بێ بەش کراون و زیانیان لێ کەوتوە دوای ئەوە، بە جۆرێک پەرەپێدانی هاوسەنگ بۆ هەمو ناوچە جیاجیاکانی وڵات دابین بکات و ئەمەش بەیاسا ڕێک دەخرێت.

دوەم- حکومەتی فیدراڵ و حکومەتی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکان بەیەکەوە هەڵدەستن بە نەخشەکێشان بۆ ستراتیژیە پێویستەکان بۆ بەرەو پێشەوە بردنی سامانی نەوت و گاز بە جۆرێک بەرزترین سود بۆ گەلی عیراق بەدی بێنێت بە پشت بەستن بە نوێترین تەکنەلۆژیا و پرەنسیپەکانی بازاڕ و هاندانی بەرهەم هێنان.

سەرەڕای ئەم دو مادەیە مادەیەکی تریش خرایە دەستورەوە کە ئەویش بەشێکی پێوەندی بە نەوتەوە هەبو. پێش ڕوخانی ڕژێمی بەعس هەندێ گرێبەست لە گەڵ هەندێ کۆمپانیای بیانی ئیمزا کرا بو بۆ گەڕان بە دوی نەوت و دەرهێنانی دا. ئەو مادەیە ئەبو ئەو گرێبەستانە لە هەڵوەشاندنەوە بپارێزێ.

مادەی ١٤١: «ئەویاسایانەی لە ساڵی (١٩٩٢) بەولاوە لە هەرێمی کوردستان دانراون و بەردەوام کاریان پێ دەکرێت و هەمو بڕیارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان —بە بڕیارەکانی دادگا و گرێبەستەکانیشەوە- کاریان پێ دەکرێت مەگەر هەموار بکرێت،یان هەڵبوەشێندرێنەوە بە پێیاساکانی هەرێمی کوردستان لە لایەن لایەنی تایبەتمەندەوە کە ناکۆک نەبن لەگەڵدەست»

* لە سەردەمی وەزارەتەکەی مالیکی دا کێشەی نەوت لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەندی دا بە زەقی ئاشکرا بو. د. حسێن شەهرستانی وەزیری نەوت لە کابینەکەی مالیکی دا، کە لە سەر لیستی ئیئتیلافی شیعەیە، بە ئاشکرا دژی گرێبەستەکانی پێشوی نێوان حکومەتی هەرێم و کۆمپانیا بیانیەکان دوا و، داوای کرد کە سەرلەنوێ بە هەمو گرێبەستەکان دا بچنەوە و، دوای ئەوەی لە سلێمانی و هەولێر چەند گرێبەستێکی نوێ ئیمزا کران، شەهرستانی هەمو ئەم گرێبەستانەی بە «ناقانونی» دانا و، هەڕەشەی سزادانی لەو کۆمپانیا بیانیانە کرد کە گرێبەستی نەوتیان لە گەڵ هەرێمی کوردستان ئیمزا کردوە.

## ئەم کێشەیە چەند لایەنی جیاوازی هەیە:

### لایەنی سیاسی

لە هەمو گفتوگۆکانی کورد — بەعس دا، سەرانی بەعس بە ئاشکرا ئەیان وت بۆیە ڕێگە نادەن کەرکوک بخرێتە سەر «ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان» چونکە ئەبێتە بنچینەی

ئابوری دەوڵەتی کوردی و جیابونەوەی کوردستان لە عیراق. عەقلیەتی ئیستای شەهرستانی نواندنەوەی هەمان عەقلیەتی شۆڤێنی نەتەوەپەرستەکانی عەرەبی سەردەمی حوکمی مەلەکی و جمهوری عیراقە.

## لایەنی دەستوری

گەڕانەوەیە بۆ حوکمی مەرکەزی و، هەڵوەشاندنەوەی مادەکانی ١١١ و ١١٢ و ١٤١ی دەستوری عیراقە کە جۆرێکە لە گەرەنتی دەستوری بۆ جێبەجێ کردنی سەرەتای فیدرالی «دابەشکردنی دەسەڵات و سامان و ئەرز» لە نێوان هەرێم و ناوەندا. کێشەکەکە ئەگەرچی بە رواڵەت خراوەتە قاڵبی قانونیەوە بەڵام جەوهەرەکەی سیاسیە.

## لایەنی ئابوری

ئەیەوێ ژێرخانی ئابوری کوردستان وەکو جاران بە لاوازی بمێنێتەوە و، نەتوانێ پشت بە خۆی ببەستێ و تا هەتایە هەر دەستدەخۆری حکومەتی ناوەندی بێ، بۆ ئەوەی هەرگیز بیر لە جیابونەوە نەکاتەوە.

* لە سەردەمی سەفیر زاڵمای خەلیل زادا پرۆژەیەک بۆ قانونی نەوت و غاز لە عیراق ئامادە کرا و، لە ئەنجومەنی وەزیرانی عیراق دا بە پەسەندکراوی تێپەڕی و نێردرایە ئەنجومەنی نوێنەران بۆ پەسەندنی. خەلیلزاد ئەیویست ئەو قانونە بکا بە سەرکەوتنێکی سیاسی بۆ خۆی و هەرچی زوتر لە پارلەمانی عیراق، پێش رۆیشتنی خۆی، تێ بپەڕێ. بەڵام قانونەکە لە زۆر لای جیاوازی سوننی و شیعی و کوردی عیراقی و زۆر لایەنی عەرەبیەوە، لە روانگەی جیاواز و بە بیانوی جیاوازەوە، کەوتە بەر هێرش و رەخنە. سەرەنجام قانونەکە بەر لە پەسەندنی لە پارلەمانی عیراق دا راگیرا و، خەوێنرا.

ئەگەر ئەم قانونە پەسەند بکرایە هەمو ئەو مادانەی لە دەستوری عیراق دا سەبارەت بە پرسی نەوت جێ کرا بونەوە و لە ریفراندۆمی دەستوردا زۆرایەتی خەڵک دەنگی بۆ دا بو، بە کردەوە هەڵئەوەشایەوە. دەسەڵاتەکان ئەکەوتەوە دەس حکومەتی ناوەندی.

بۆ دەسپێشکەری و، رێبڕین لە تێپەڕینی ئەم قانونە، حکومەتی هەرێمی کوردستان بە پەلە پرۆژەی قانونێکی بۆ نەوت و غاز لە کوردستاندا ئامادەکرد و حەواڵەی ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستانی کرد. ئەویش بە پەلە و بێ ئەوەی ماوەی پێویست بدا بە ئەندامەکانی و بە خەڵک بە تێروتەسەلی گفتوگۆی لە سەر بکەن، پەسەندی کرد و خرایە مەیدانی کار پێ کردنەوە.

پێش پەسەندنی ئەم قانونە و، پێش روخانی رژێمی بەعس و دوای روخانی رژێم چەندین گرێبەست لە کوردستان دا ئیمزا کراون. پەسەندنی ئەم قانونە چەندین کۆمپانیای بیانی

نوێی هێنایە ناو کایەکەوە و چەندین گرێبەستی تر ئیمزا کران.

گرێبەستەکانی ئیمزا کراون و قانونی نەوت و غازی کوردستان هەرچی بەندو باوێکی بە دواوە بێ و، هەرچی تانەیەکی لێ بدرێ و، هەرچی قسە و باسێکیان لە سەر بکرێ، هێشتا بە هەنگاوێکی زۆر گرنگ دائەنرێ لە بواری کەڵک وەرگرتن لە سامانی سروشتی کوردستان و بنیاتنانی ژێرخانی ئابوری دا و لە بواری دابین کردنی پێویستیە ژیانیەکانی خەڵکی کوردستان دا بە تایبەتی سوتەمەنی و کارەبا.

نابێ کورد بە هیچ جۆرێ و لە ژێر هیچ گوشارێکی ناوەکی و دەرەکی دا، دەسهەڵبگرێ لە مافەکانی خۆی:

مافی خۆ بە خاوەن زانینی سەرچاوە سروشتیەکانی کوردستان- لەوانە سەرچاوەکانی نەوت و غاز و ئاو — مافی بە کار هێنان و وەبەرهێنانی بۆ قازانجی خەڵکی کوردستان.

ئەمە تۆباڵی مێژوییە لە ئەستۆی سەرکردایەتی کوردا.

* بەڵام گەورەترین مەترسی لە سەر ئەم گرێبەستانە ئەوەیە لە تاریکی دا، لە ژوری داخراودا، بێ ئاگاداری خەڵکی کوردستان، تەنانەت بێ ئاگاداری شارەزا و پسپۆری ئەم بوارە ئەنجام ئەدرێن.

• **لایەنەکانی گفتوگۆ لە سەر پرسی نەوت کێن؟**

لایەنی کوردی کێن؟ حکومەتی هەرێمی کوردستانە، نوێنەری حیزبەکانی دەسەڵاتن؟ کۆمپانیای کەرتی تایبەتی کوردستانین؟

کۆمپانیا بیانیەکان کێن؟ رەگەزنامەی کوێیان هەیە؟ سەرمایەیان چەندە؟ پێشتر لە بواری نەوت دا چییان کردوە؟

• **گفتوگۆکان لە سەر چین؟**

گەڕان بە دوی نەوت دا؟ دۆزینەوەی؟ هەڵکەندنی بیر؟ هەڵهێنجانی؟ هەناردنی؟ فرۆشتنی؟ کێ سەرمایەی ئەنجامدانی قۆناغەکانی دابین ئەکا و مەرجەکانی چین و دوایی ئەم سەرمایەیە چۆن وەرئەگیرێتەوە؟

• **قازانجەکەی چۆن دابەش ئەکرێ و پشکێ هەر لایە چەندە؟**

پشکی کۆمپانیاکان؟ پشکی خەڵکی ناوچەکە؟ پشکی حکومەتی هەرێم؟ پشکی حکومەتی بەغداد؟

* بۆ ئەوەی حکومەتی هەرێم لەم ململانێیەدا لە گەڵ حکومەتی ناوەندی دا بەهێز بێ، ئەبێ پشت ئەستور بێ بە پشتیوانی خەڵک، بۆ ئەوەی پشتیوانی خەڵک بە دەس بهێنێ، ئەبێ لە هەمو هەنگاوەکانی دا لە رۆشنایی دا بە ئاشکرا کار بکا.

# حیزب و حوکم:
# ئەزمونی کوردستان★

**سەرەتا:**

بۆ ئەوەی قسەی هەندێ ببڕم لە سەرەتاوە ئەڵێم: بە پێی ئەو جێگەیەی کە من هەمبوە لە ناو کۆمەڵە و لە ناو یەکێتی نیشتمانی دا، بە شانازیەوە بەشدار بوم لە دروستکردن و دامەزراندنی ئەزمون و قەوارەی کارگێڕی، سیاسی، قانونیی ئێستای کوردستانی عیراق دا بە هەردو لایەنی ئیجابی و سەلبییەوە. لە هەردو لایەنیدا پشکێکی بەرپرسیارێتی کەمیان زۆر، بە خراپیان بە چاک، بەر من ئەکەوێ. هەرگیز خۆم لەم لێپرسراوێتیە نادزمەوە، لە بەردەمی مێژوی گەلەکەم دا بە سەربەرزیەوە ئەتوانم داکۆکی لە هەردوکیان بکەم.

لە پاش ١٦ ساڵ حوکمی کوردی کاتی ئەوە هاتوە ئەم ئەزمونە لە هەمو لایەنێکیەوە هەڵسەنگاندنێکی رەخنەگرانە، هەڵسەنگاندنێ کە لە نرخی ئەزمونەکە کەم نەکاتەوە، بەڵام لە هەمان کات دا کەموکوڕیەکانی نەشارێتەوە.

هەندێ کەس، بە تایبەتی ئەوانەی سودمەندن لە گەندەڵی، کە باس لە کێشەکانی ئێستای ناو کوردستانی عیراق ئەکەن بۆ ئەوەی ناوەرۆکی سیاسی ناکۆکیەکان بێ مانا بکەن، هەوڵ ئەدەن بیخەنە قاڵبی ململانێی شەخسی و شەڕی کورسی و کێشەی تایبەتیەوە. سودمەندانی گەندەڵی زۆرجار کە باسی گیروگرفتەکان ئەکەن بۆ ئەوەی رەهەندی سیاسی، کارگێڕی، دارایی، کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی گەندەڵی بشارنەوە قەیرانی

---

★ سایتی سبەی ٤-٨/٦/٢٠٠٨

رۆژنامەی رۆژنامە ١٩٢-١٩٥ لە ٦-٩/٤/٢٠٠٨

چەند پاڵوی ئێستای کوردستان لە مەسەلەی «پارەوپول» و «دەوڵەمەن بونی چەند کەسێکا» پچوک ئەکەنەوە. ڕاستە پێکەوەنانی ناقانونی پارەوپول بەشێکە لە قەیرانی گەندەڵی، بەڵام گەندەڵی (وەکو پێش چەند ساڵ لە کۆڕێکی تەلەفزیۆنی دا بە ئاشکرا وتم) وەکو گانگرین چۆتە جەستەی حیزب و حکومەتەوە، لە هەمو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵەکەمان دا ڕەنگی داوەتەوە.

لەم چەند کورتە وتارەدا گەرەکمە لە باری سەرنجی خۆمەوە، بە زمانێکی کوردی کە هەمو کەس تێی بگا هەندێ بابەت کە پێوەندی بە ئێستا و داهاتوی گەل و وڵاتەکەمانەوە هەیە، بخەمە بەر باس و هەڵسەنگاندن. هەندێ بابەت کە چەند ساڵێ پێش ئێستا نوسیومن بۆ بیرهێنانەوە و بەراوردکردنی ئەمڕۆ لە گەڵ دوێنێ، سەرلەنوێ بڵاو بکەمەوە.

**لەوانە:**

حیزب و دەسەڵاتی تەنفیزی. حیزب و دەسەڵاتی تەشریعی. حیزب و دەسەڵاتی قەزایی. حیزب و هێزە چەکدارەکان. حیزب و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی. حیزب و زانکۆ. حیزب و ڕێکخستنی ئابوری وڵات. حیزب و بەشداری کورد لە دەسەڵاتی ناوەندی بەغداد.

ڕەنگە ئەمە روناکیەک بخاتە سەر لایەنە فیکریەکانی ئەو ناکۆکییانەی من و هەندێ لە هاوڕێکانم هەمانە لە گەڵ خەڵکی تر، بە تایبەتی ئەوانەی لە دەسەڵات دان، چ حیزبی و چ حکومەتی.

لێرەدا سەرەباسەکان ئەخەمە سەر مێزی لێدوان خۆم لە هەندێکیان ئەدوێم و لێدوانی هەندێکی بۆ خەڵکی تر بە جێ ئەهێڵم بەو هیوایەی ئەمە دەرگا بە فراوانی بکاتەوە بۆ ئەم بابەتە ژیانییانەی پێوەندییان بە ئێستا و داهاتوەوە هەیە.

## یەکەم: حیزب و دەسەڵاتی تەنفیزی

لە وڵاتانی پارلەمانیدا، دوای هەڵبژاردن ئەو لیستەی زۆرایەتی ئەندامانی پارلەمان ئەباتەوە ڕائەسپێردرێ کابینە پێک بهێنێ، ئەویش یەکێ لە ئەندامە دەرچوەکانی ڕائەسپێرێ و، پاش ڕاوێژ و پرسوڕا لەگەڵ سەرکردایەتی حیزبەکەی (یان حیزبەکان) هاوکارەکانی بۆ وەزارەتەکان هەڵئەبژێرێ و ئەیانباتە بەردەمی پارلەمان بۆ ئەوەی باوەڕی پێ بدەن.

پارلەمان لە هەندێ وڵات بە کۆمەڵ دەنگ ئەدا بە ئەندامانی کابینەکە لە هەندێ وڵاتی تر لە سەریەک بەیەکی وەزیرەکان.

ئەگەر کابینەکە باوەڕی پارلەمانی بە دەس هێنا دەس ئەکەن بە ئەنجام دانی بەرنامەی وەزارەتەکەیان و ئەگەر باوەڕی پارلەمانی وەر نەگرت پرۆسەکە دوبارە و چەند بارە ئەبێتەوە.

لە سیستەمی سەرۆکایەتی‌دا، سەرۆک هەمان کار ئەکا.

کورد لە مێژوی دورودرێژی خۆی دا دو جار دەرفەتی بۆ رەخساوە وەزارەت پێک بهێنێ:

جاری یەکەم، ساڵی ١٩٢٢ لە سەردەمی شێخ مەحمودی حەفیدا کە خۆیان پێیان وتوە (کابینە)، بەڵام ئەم کابینەیە لە ساڵێ زیاتر دەوامی نەکردوە بە هۆی هێرشی ئینگلیزەوە بۆ سەر کوردستان حکومەتەکەی شێخ مەحمود و کابینەکەی روخاوە.

جاری دوەم، ساڵی ١٩٤٦ لە سەردەمی قازی محەمەدا، کە خۆیان پێیان وتوە (هەیئەتی رەئیسە)، بەڵام ئەم هەیئەتەش لە ساڵێ زیاتر دەوامی نەکردوە بە هۆی هێرشی ئەرتەشی ئێرانەوە بۆ سەر کوردستان حکومەتەکەی قازی محەمەد و هەیئەتەکەی روخاوە.

جگە لەم دو وەزارەتە ئیتر کورد تا راپەڕینی ١٩٩١ هەلێکی تری بۆ هەڵ نەکەوتوە وەزارەتی تایبەت بە خۆی دابمەزرێنێ و تەجروبەی پێکینانی وەزارەتی لە لا کەڵەکە ببێ، تەجروبەی (مەجلیسی تەنفیزی) حوکمی زاتی، تەجروبەیەکی بەعسی و تەجروبەی بەشداری وەزیرە کوردەکانی سەردەمی مەلیکی و جمهوریش لە دەرەوەی نوێنەرایەتی دەسەڵاتی کوردی بو.

بۆ یەکەمین جار لە دوای راپەڕین کورد توانی (وەزارەت)ی تایبەت بە خۆی واتە هێزی بنەڕەتی دەسەڵاتی تەنفیزی وڵات دابمەزرێنێ.

پێکهێنانی ئەنجومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان لە مێژوی کوردا بە وەرچەرخانێکی سیاسی گرنگ دائەنرێ، بەڵام لە هەمان کاتدا تەجروبەیەکە رەنگە تایبەت بێ بە کورد خۆی و لە وڵاتانی تری دنیادا نمونەی نەبێ. یەکەمین وەزارەت کە پێک هات، سەرکردایەتی یەکێتی و پارتی رێک کەوتن:

ئەنجومەنی وەزیران نیوە بە نیوە بێ و، هەندێ وەزارەتیش بەشی حیزبەکانی تر بدەن بۆ ئەوەی بێ دەنگیان بکەن.

وەزیرەکان خۆیان دایان بنێن، بێ پرسی سەرۆکی وەزیران، بێ دەنگدانی ئازادی پارلەمان.

سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و جێگرەکەی، وەزیرەکان و جێگرەکانیان، وەک یەک

و به قەد یەک دەسەڵاتی ئیداری، قانونی، داراییان هەبێ، به کردەوە، دو سەرۆک بۆ ئەنجومەنی وەزیران و دو وەزیر بۆ هەر وەزارەتێک.

## ئەم تەجروبە بێ نمونەیە:

١. رێگەی گرت له دروست کردنی ئیدارەیەکی یەکگرتو، به کردەوە هەمو وەزارەتەکانی کرد به دو وەزارەت و، کارمەند و فەرمانبەرەکانی دابەش کرد بەسەر دو حیزب دا.
٢. رێگەی گرت له راپەراندنی ئیشوکاری خەڵک، له دانانی پلانی دابینکردن و خزمەتگوزاری گشتی و، گەشەپێدانی ئابوری.
٣. رێگەی گرت له خولقاندنی دڵسۆزی بۆ نەتەوە و نیشتمان
٤. رێگەی گرت له دوبارەکردنەوەی هەڵبژاردن.

ئەم تەجروبەیە سەرەنجام به هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ و، دابەشبونی کوردستان بۆ سێ هەرێم: (هەرێمێکی ژێر دەسەڵاتی یەکێتی، هەرێمێکی ژێر دەسەڵاتی پارتی، هەرێمێکی ژێر دەسەڵاتی بزوتنەوەی ئیسلامی) و بۆ دو کابینە و دو حکومەت کۆتایی هات.

دو حکومەت له دو هەرێم دا چەندین ساڵ درێژەی کێشا تا له ژێر گوشاری روداوەکانی عیراقدا، به ناچاری هەندێ له وەزارەتەکان بەجۆرێکی (فەوقی) له سەرەوە یەک خران و، هەندێکیشی، به تایبەتی گرنگەکان، به دوانەیی مانەوە لەوانە (پێشمەرگە، دارایی، کاروباری ناوخۆ).

تەجروبەی پێکهێنانی کابینەی دوای یەکخستنەوەی هەردو ئیدارە ئەویش دیسان تەجروبەیەکی بێ نمونەیە، رەنگە به داهێنانێکی کوردی دابنرێ.

سەرکردایەتی یەکێتی و پارتی ژمارەی ئەندامانی کابینەکەیان له ٤٠ وەزیر تێ پەڕاند.

بێ ئەوەی کەسێ دیاری بکەن و رایبسپێرن بۆ هەڵبژاردنی وەزیرەکان و بواری بدەن پاش راوێژ و پرسوڕا هاوکارەکانی بدۆزێتەوە، بێ ئەوەی ئازادی دەنگدان و بێ ئەوەی پرس و راوێژ به سەرۆکی راسپێردراوی ئەنجومەنی وەزیران بکەن خۆیان ناوی وەزیرەکانیان بۆ دیاری کرد.

باوەڕ بەخشین و باوەڕ نە بەخشین بدەن به پارلەمانی کوردستان و وەزیرەکانیان دان.

ئەنجومەنی وەزیران که ئەبێ بەرزترین دەسەڵاتی تەنفیزی وڵات بێ، بۆتە بەڕێوەبەری وەزارەتەکانیان، له سەرو ئەوانەوە حیزب دەسەڵاتی تەنفیزی راستەقینەیە له کوردستان دا.

حیزب وەزیرەکان دائەنێ، ئەمەیان شتێکی ئاساییە
حیزب وەکیلی وەزیر و خەبیر و موستەشار دائەنێ.
حیزب بەڕێوەبەری گشتی و بەڕێوەبەری فەرمانگەکان دائەنێ.
حیزب قایمقام و مدیر ناحیە و سەرۆکی شارەوانی دائەنێ.
حیزب کارمەندی گەورە و بچوک دائەنێ.
بە واتەیەکی تر: دەسەڵاتی حیزب لە سەرو دەسەڵاتی تەنفیزیەوەیە.

لە هەمو گفتوگۆکانی بەعس — کورد یەکێ لە خواستە سەرەکیەکانی نوێنەرایەتی کورد، هەڵوەشاندنەوەی «مەجلیسی قیادەی سەورە» و جیاکردنەوەی دەسەڵاتی حیزبی بەعس بو لە دەسەڵاتی دەوڵەتی عیراق. کەچی ئێستا حیزب لە کوردستان دا هەمان تەجروبە دوبارە ئەکاتەوە.

**ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتوە:**

– حیزب دوای ناودێری وەزیرەکان و پێکهێنانی وەزارەت، واز لە دەستێوەرانی کاروباری حکومەت بهێنێ؟
– حیزب واز لە پارلەمان بهێنێ لە وەزیرەکان بپرسێتەوە، باوەڕیان پێ ببەخشێ و، باوەڕیان لێ بسێنێتەوە؟
– حیزب خەریکی حیزبایەتی بێت و ئازادی بدا بە وەزیرەکان وەکو وەزیری هەمو خەڵک کاروباری وەزارەتەکانیان رابپەڕێنێن؟
– وەزیرەکان بێ لێکدانەوەی (ئیعتیباری حیزبی) بە پێی پێوەری کارگێڕی و قانونی کارمەندانی گەورە و پچوکی وەزارەتەکانیان هەڵبژێرن؟

## دوەم: حیزب و دەسەڵاتی تەشریعی

دوای ئەوەی گفتوگۆی بەرەی کوردستانی — بەعس لە شوێنی خۆی دا چەقی و، بۆشایی دەسەڵات، لە ئەنجامی ئەوەش دا بۆشایی ئیداری و ئەمنی و قانونی... لە کوردستان دروست بو. سەرکردایەتی بەرەی کوردستانی بڕیاری دا هەڵبژاردنی گشتی بکرێ و، لوجنەیەکی دروست کرد بۆ نوسینی قانونەکانی. لوجنەکە قانونەکانی نوسی. یەکێکیان قانونی هەڵبژاردن بو.

قانونی هەڵبژاردن سیستەمی رێژەیی لیستی کرد بە بناغەی کار. ئەویش لە بەر هەڕەشەی حیزبە بچوکەکان: حشع، حسک، گەل، زەحمەتکێشان، پاسۆک، ئاسوری...

سور بون له سەر ئەوەی هەڵبژاردن به لیست و رێژەیی بێ و هەڕەشەی ئەوەیان کرد کە ئەگەر قانونەکە بەو جۆرە دانەرێژرێ ئەوان بایکۆتی ئەکەن.

له ژێر گوشاری ئەو حیزبانەدا سیستەمی رێژەیی پەسند کرا، بەڵام بەو مەرجەی هەر حیزبێ ٧٪ کەمتر بهێنێ رێگەی چونە ناو پارلەمانی نەدرێ.
هەڵبژاردن ئەنجام درا جگە لە یەکێتی و پارتی هیچ حیزبێ ٧٪ی رێژەی دەنگدەرانی نەهێنا و نەیانتوانی بەشداری پارلەمان بن. ئەگەر لە شەوی راگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن دا، ئەو رێژەیە لاببرایەو هەر حیزبە بەو چەند کورسیەی بە دەستی هێنا بو بەشدار بێ. حیزبە بچوکەکان بە بەشی خۆیان رازی نە بون و ئامادە نەبون لە پارلەمان دا بەشدار بن، لە باتی ئەوە داوایان کرد لە وەزارەتەکانا بەشیان بدرێ.
رێژەی حیزبە دەرنەچوەکان دابەش کرایەوە بە سەر یەکێتی و پارتی دا پارتی چەند هەزار دەنگێکی زیاتر بو، داوای ئەکرد کورسیەکی لە یەکێتی زیاتر بێ. بەڵام سەرەنجام بۆ خاوکردنەوەی هەلومەرجی گرژی کوردستان رێککەوتن کە پارلەمان نیوە بە نیوە، پەنجا بە پەنجا دابمەزرێ، کابینەیەکی ئیئتیلافی پێک بێ سەرۆکی کابینە و جێگرەکەی وەزیر و جێگرەکەی وەکو یەک دەسەلاتیان هەبێ.

..................

دوای هەڵبژاردنێکی پڕ هەراوهوریا، پڕ مشتومڕ، پڕ رەخنە، سەرکردایەتی هەردو حیزب پێکهاتن لە سەر دروستکردنی نیوە بە نیوەی پارلەمان، ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان پێکهات و کۆ بوەوە.
بە دوای ئەوەدا بە چەند هەفتەیەک سەرکردایەتی حیزب یەکەمین کابینەی نیوە بە نیوەی دامەزراند.
هاوڵاتیانی کوردستان، سەرەڕای هەمو ئەو رەخنانەی هەمو لایەکان لە هەڵبژاردن و جۆری پێکهێنانی پارلەمان و کابینە کەیان ئەگرت، بە خۆشی و بە ئومێدێکی زۆرەوە، لەم دامەزراوەیان ئەڕوانی.
هەر لە سەرەتاوە، حیزب بە چاولێکەری حیزبی بەعس و حیزبە شیوعیەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات، لە پاڵ هەردو دامـەزراوەدا دەسەڵاتی باڵای خۆی پاراست و، خۆی بو بە فەرماندەو چاو ساغ و رێپیشاندەری حکومەت و پارلەمان و ئەرکەکانی پارلەمانی بچوک کردەوە بە دانانی قانون.
ئەرکی یەکەمی پارلەمان، باوەڕ بەخشین و باوەڕ سەندنەوەیە لە سەروەزیران و وەزیرەکان. سەرکردایەتی هەردو حیزب بە کردەوە ئەم مافەیان لە پارلەمان سەندەوە،

ئەوانەیان بە وەزیر سەپاند کە خۆیان ئەیانویست بێ ئەوەی رێ بدەن بە پارلەمان هیچ کەسێکیان رەت بکاتەوە.

ئەرکی دوەمی پارلەمان، لێکۆڵینەوەی بودجەی ساڵانەی وڵاتە، داهاتی حکومەت و جۆری دابەشکردن بە سەر کەرتەکانی ژیانی کۆمەڵ و جۆری سەرفکردنی...

سەرکردایەتی حیزب ئەم مافەیان بە پارلەمان رەوا نەدیت و خۆیان لە ناو خۆیان دا چەند کەسێکی کەم، لە باتی پارلەمان دەستیان گرت بە سەر بودجەی مانگانە و ساڵانە دا خستیانە ناو تاریکیەکی ئەوتۆوە رەنگە ئێستا و دوا رۆژیش نەتوانرێ ئاشکرا بکرێ.

ئەرکی سێیەمی پارلەمان، کە بەشداریە شان بە شانی حکومەت لە داڕشتنی کاروباری سیاسی وڵات و رێگە چارەکانی دا، بە تایبەتی کێشە چارەنوسسازەکان، ئەو مافەش بە پارلەمان رەوا نە بینرا، بەڵکو مەسەلە چارەنوسسازەکان، سەرکردایەتی هەردو حیزب بڕیاریان لە سەر ئەدا و ئەوان (موافەقەت)یان لە سەر ئەکرد.

حیزب پاڵێوراوەکانی خۆی دائەنێ بۆ پارلەمان، ئەمەش شتێکی ئاساییە.

حیزب لیستی پاڵێوراوەکان دیاری ئەکا و خۆی ریزبەندی یەکەمین و دوایەمینیان ئەکا.

حیزب دەزگاکانی راگەیاندنی بە دەستە بۆ پروپاگەندەی هەڵبژاردن.

حیزب سەرچاوەی دارایی لە بەر دەستدایە بۆ راپەڕاندنی پروپاگەندەی هەڵبژاردن.

حیزب دەسەڵاتی چەکداری بە دەستە.

حیزب کارمەند و سەرپەرشتیارانی ناوەندی هەڵبژاردن و سندوقەکان دائەنێ.

**ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتوە:**

**- حیزب لە دوای ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ئازادی بە پارلەمان بدا ئەرک و مافەکانی خۆی لە دەنگدان لە سەر وەزیرەکان، لە سەر بودجەی ساڵانە، لەسەر مەسەلە چارەنوسسازەکان بە کار بهێنێ.**

**- حیزب واز لە پارلەمان بهێنێ ئەندامەکانی بە پێی ویژدانی نیشتمانی‌یان، بە ئازادی کاربکەن، نەک بە پێی فەرمان و رێنمایی حیزب.**

## سێیەم: حیزب و دەسەڵاتی قەزایی

لە سەردەمی میرنشینە کوردیەکان دا، دو جۆر دەسەڵاتی دادوەری لە کوردستان دا هەبوە، کە هەردوکی کاری پێکراوە و بڕیارەکانی لەلایەن کۆمەڵ و لە لایەن دەسەڵاتدارانی سەردەمەوە رێز لێ گیراو بوە:

**١. دەسەڵاتی شەرعی- دینی**

ئەم دەسەڵاتە لەلایەن زانا ئاینیەکانەوە (مەلاکان) و بە زۆری لە مزگەوتەکان دا ئەنجام دراوە، لە ناو مەلاکان دا کەسانی شایستە و هەڵکەوتو لە لایەن میرەکانەوە هەڵبژێردراون و کراون بە قازی.

قازیەکان و مەلاکان بە پێی قورئان و حەدیس و سونەت و ئیجتیهادی فەقیهەکان و فتوای زانا ئاینیەکان کێشەکانی کۆمەڵیان بە لادا خستوە، هاوسەرگیری و کاروباری خێزان و دابەشکردنی میرات و... لە کارە سەرەکیەکانیان بوە.

**٢. دەسەڵاتی خێڵەکی- کۆمەڵایەتی**

ئەم دەسەڵاتە سەرۆکی عەشیرەت و دەمڕاست و پیاو ماقوڵانی عەشیرەتەکان و بە زۆری لە دیوەخانی ئاغادا ئەنجام دراوە. لە ناو عەشیرەتەکان دا کەسانی دەسەڵاتدار و دەمڕاست و ماقوڵ هەبون، کە لەناو کۆمەڵەکانی خۆیان دا رێز لە قسە و ئامۆژگاری و بڕیارەکانیان گیراوە.

ئەمانە بە پێی عادەت و عورفی کۆمەڵایەتی باوی سەردەم کێشەکانیان بەلادا خستوە، بە زۆری کێشە خوێناویەکان کوشتنیان لێ کەوتۆتەوە بە تایبەتی کوشتن و، تۆڵە و، زەوی وزار و لەوەڕگا... لە کارە سەرەکیەکانیان بوە.

لە دوای نەمانی دەسەڵاتی میرایەتیەکانی کورد و، دامەزراندنی حوکمی ناوەندی عوسمانی جۆرێکی تری دەسەڵاتی قەزایی هاتۆتە کوردستانەوە کە دەسەڵاتی قانونیی- دەوڵەتی بوە.

عوسمانیەکان، لە پاڵ شەریعەت دا، چەند قانونیان دانابو بۆ ئەوەی کێشە گرنگەکانی کۆمەڵی پێ چارەسەر بکەن و، بۆ ئەم مەبەستە دادگایان دامەزراندبو. ئەگەر چی ((دادگای دەوڵەتی)) ئەبو جێگەی هەردو دەسەڵاتەکە بگرێتەوە، بەڵام نەیتوانی بنبڕیان بکا، هەردوکیان وەکو دو دەزگای ناڕەسمی بە لاوازی مان.

دوای داگیرکردنی عیراق لەلایەن بەریتانیاوە، ئینگلیز ((قانونی سوڵحی عەشایەری)) دانا و سەر لە نوێ دەسەڵاتی خێڵەکی- کۆمەڵایەتی لە چارەسەر کردنی کێشەکان دا زیندو کردەوە. بەڵام ئەمە دوای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ لە عیراق هەڵوەشێنرایەوە و لە کار خرا و هەمو کێشەکان کەوتەوە دەس دادگا قانونیەکانی دەوڵەت.

لە دوای راپەرینەوە، کە بۆشایی دەسەڵات لە کوردستان دروست بو دەسەڵاتی حکومەتی قانونی لاواز بو، ئەم ٣ سێ دەسەڵاتە سەر لە نوێ زیندو بونەوە، بەڵام هەریەکەی بە جۆرێک.

جوڵانەوە ئیسلامیەکان لەو ناوچانەدا کە دەستیان تیا ئەڕۆشت (هەیئەتی شەرعی)یان

دانا و، کەوتنە جێبەجێ کردنی شەریعەت، بەڵام بە جۆرێکی دواکەوتوی لە بابەتی تالیبانی ئەفغانستان.

حیزبە عیلمانیەکان لە هەمو ناوچەکان دا مەکتەبی کۆمەڵایەتیان دامەزراند لە سەرانی خێڵ و هۆز و کەسایەتی کۆمەلایەتی ناسراو و نەناسراو بۆ بەلادا خستنی کێشە گەورە و بچوک و، وەکو دەزگایەکی (بدیل)ی دادگاکانی دەوڵەت.

حکومەت کە لە سەرەتادا نیوە بە نیوە لە بەینی یەکێتی و پارتی دا دامەزرا و، پاش شەڕی ناوخۆ بو بە دو حکومەت و، دوای یەکگرتنەوەش دیسانەوە بە جۆرێکی تر لە سەر بنچینەی نیوە بە نیوەی یەکێتی و پارتی دروست کرایەوە، داودەزگای قەزاییان خستە ژێر دەسەڵاتی حیزبەوە.

حیزب وەزیری عەدل دائەنێ.
حیزب ئەندامانی مەحکەمەی تەمیز دائەنێ.
حیزب ئەندامانی مەجلیسی قەزا دائەنێ.
حیزب حاکم دائەنێ.
حیزب مدعی عام و نائیبی مدعی عام دائەنێ.
حیزب کاتبی عەدل دائەنێ.
حیزب بەشی زۆری کارمەندانی گەورە و بچوکی داودەزگای قەزایی دائەنێ.

سەرەرای ئەمانەش کۆلیجەکانی حقوق و خوێندنی بەرزیباسا تا رادەیەکی زۆر تەرخان کراوە بۆ ناوێرەکانی حیزب.

لە وڵاتێک دا، داودەزگای قەزائی بە مجۆرە دابنرێ. لە وڵاتێک دا، مەکتەبی کاروباری کۆمەڵایەتی (کە لە لایەن حیزبەوە دانراون) دەسەڵاتی یەکلایی کردنەوەی هەمو کێشە گرنگەکانی هەبێ و بتوانێ بڕیارەکانی خۆی بەسەر مەحکەمەدا بسەپێنێ، ئەبێ چۆن سەربەخۆی دەسەلاتی قەزایی باس بکرێ؟

**ئاخۆ ئیتر کاتی ئەوە نەهاتوە:**

— حیزب و ئیعتیباری حیزبی دور بخرێتەوە لە دەسەڵاتی قەزایی؟

— مەکتەبی کۆمەڵایەتی دور بخرێتەوە لە دەستێوەردانی دامـەزراوەی قەزایی؟

— داودەزگای قەزایی لە سەر بنچینەی پیشەیی و بێلایەنی و لێوەشاوەیی

دابنرێ؟
دامەزراوە ئاکادیمیەکانی حقوق دور رابگیرێ لە دەستێخستنی حیزب؟

# چوارەم: حیزب و زانکۆ

عیراق بە گشتی لە چاو وڵاتانی ئەوروپی دا نەریتی ئاکادیمی تازەیە. لە بیستەکانی سەدەی بیستەم دا هەندێ کۆلیجی (یاسا، پزیشکی، ئەندازیاری دامەزراندوە، لە کۆتایی پەنجاکانی سەدەی بیستەم دا. زانکۆی بەغدای دامەزراندوە.

یەکەمین زانکۆ لە کوردستان دا ساڵی ١٩٦٨ لە سلێمانی دامەزرا

یەکێ لە خواستەکانی بزوتنەوەی نەتەویی کورد لە عیراق دا، چەکدار و هێمنانە، کردنەوەی خوێندنگەی جۆراوجۆر و، لە دوای ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ کردنەوەی زانکۆ بو.

زانکۆی سلێمانی لە ماوەی چەند ساڵێک دا گەشەی کردوە، لە ناو زانکۆکانی عیراق دا جێگەی خۆی کردەوە، ئەگەر چی حیزبی بەعس هەوڵێکی زۆری دا کە زانکۆی سلێمانی بکاتە مەڵبەندی بە بەعسی کردنی خوێندکارانی کورد. بەڵام سەرکەوتو نەبو، بەڵکو بە پێچەوانەوە بو بو بە مەڵبەندی پێگەیاندنی کادری شۆڕشگێڕ و دژی بەعس و لە ئەنجامی ئەوەش دا بۆ سزا دانی خەڵکی سلێمانی بە هۆی پشتیوانی کردنیان لە شۆڕشی کوردەوە، زانکۆیان لە سلێمانیەوە گوێزایەوە بۆ هەولێر ناوەکەشیان گۆڕی بۆ سەلاحەدین.

سەرەڕای هەوڵەکانی بەعسیش زانکۆی سەلاحەدین، ئەویش کە لە ژینگەیەکی سیاسی شۆڕشگێڕانە دا بو، بوبوە مەڵبەندی پێگەیاندنی نەوەیەکی رۆشنبیری شۆڕشگێڕ و کادری دڵسۆز.

لە دوای راپەڕینەوە و، لە دوای دامەزراندنی یەکەمین پارلەمان و حکومەتی هەرێمەوە سەرکردایەتی سیاسی بایەخێکی تایبەتی داوە بە زانکۆ و پەرەپیدان و کردنەوەی زانکۆی نوێ، بێگومان ئەمەش کارێکی زۆر گرنگ بو، لە کاتێکدا حکومەتی بەعس گەمارۆی کوردستانی دابو، ئەیویست گەلی کورد لە روی ئابوری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، زانستییەوە بخنکێنێ، کورد هەوڵی ئەدا خۆی لە گەمارۆ دەربهێنێ.

لە دوای راپەڕین بەعس، هەر وەکو گەمارۆی کوردستانی دابو، دەرگای زانکۆ و پەیمانگاکانیشی لە روی خوێندکارانی کورد دا داخست. سەرکردایەتی کورد کارێکی باشی کرد بۆ پڕ کردنەوەی ئەو بۆشاییە و بۆ پێگەیاندنی کادری زانستی و دو زانکۆی نوێی لە سلێمانی و دهۆک کردەوە، کردنەوەی ئەم دو زانکۆیە ئەوەندەی پێویستیەکانی کۆمەڵ بو، ئەوەندەش هۆی سیاسی لە پشتەوە بو.

له هەر وڵاتێ یا شوێنێ کە زانکۆ ئەکرێتەوە، بۆ دابینکردنی پێوستیەکانی کۆمەڵە لە بواری جیاجیای ژیان دا و، پاش لێکۆڵینەوەی زانستی و هەڵسەنگاندنی توانای جێبە جێکردن و ئامادەکردنی پێویستیەکانی.

سەرکردایەتی کورد، ئەویش بە لاسایی کردنەوەی بەعس، لەسەر حسابی پشت گوێ خستنی پێوەری زانستی و ئاکادیمی، هەوڵی دا زانکۆ بکاتە مەڵبەندی حیزبایەتی.

حیزب بۆ مەبەستی سیاسی، زانکۆی نوێ، کۆلیجی نوێ، پەیمانگای نوێ ئەکاتەوە، بێ ئەوەی گوێ بداتە دابین کردنی پێویستیەکانی جێبەجێکردنی.

حیزب سەرۆکی زانکۆ، راگری کۆلیج، سەرۆکی بەش، تەنانەت کارمەند و فەرمانبەرەکانی دا ئەنێ.

حیزب لە رێگەی رێکخستنی حیزبی و لە رێگەی رێکخراوەکانی قوتابیان و خوێندکارانەوە دەس ئەخاتە ناو کاروباری زانکۆوە.

حیزب دەوری سەرەکی هەیە لە دیاریکردنی خوێندکارانی خوێندنی باڵای ماجستیر و دکتۆرا.

حیزب، پێڕەوی پێوەری کارگێڕی و زانستی و قانونی ناکا لە دابەشکردنی کار و زەوی و پێشجستن و سەفەری دەرەوەدا بە سەر مامۆستا و کارمەندەکانی دا..

**ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتوە**

**- زانکۆ لە کاری سیاسی جیا بکریتەوە؟**

**- حیزب و ئیعتیباری حیزبی دور بخرێتەوە لە زانکۆکان؟**

**- حیزب دەس نەخاتە کاروباری دانانی سەرۆکی زانکۆ و راگری کۆلیج و سەرۆکی بەشەکان؟**

**- حیزب دەس نەخاتە کاوباری وەرگرتنی خوێندکارانی ماستەر و دکتۆرا؟**

# ئێمه و ئەوان:
# ناکۆکیەکانمان لە سەر چین؟ ★

هەندێ لەوانەی ئەنوسنیان قسە ئەکەن بۆ رۆژنامەو گۆڤارەکان کە دێنە سەر باسی ناکۆکیەکان: ناکۆکیەکانی نێوان ئێمە «ئەوانەی رەخنە لە دەسەلآت ئەگرین» و ئەوان «ئەوانەی داکۆکی لە دەسەلآت ئەکەن» ئەڵێن:

- ناکۆکیەکان بنەمای فیکری یان نیە، بەڵکو لە سەر شتی شەخسیە...
- ناکۆکیەکان لە سەر پرۆژەی سیاسی نیە، بەڵکو لە سەر پارە و دەسەلآتە....

ئەم قسانە بۆ پوچکردنەوەی ناوەرۆکی فیکری و سیاسی ناکۆکیەکان و سوککردنی ئەو ململانێ سیاسیەیە کە لە نێوان دەسەلآت و موعارەزەدا دەستی پێ کردوە.

دیارە موعارەزەی سیاسی لە کوردستان دا هێشتا نەچۆتە چوارچێوەی هێزێکی رێکخراوی خاوەن بەرنامەی سیاسی، ئابوری، کۆمەلآیەتی، خزمەتگوزاری... «بەدیل»ی ئەم حیزب و حکومەتەی ئیستا، بەلآم هەرکەس چاودێری رەوتی سیاسی روداوەکانی ئەم چەند ساڵەی دوایی کرد بێ و، وتار و قسەکانی ئێمەی لە دەزگاکانی راگەیاندن دا خوێندبێتەوەیا بیستبێتی، ئەزانێ ناکۆکیەکانی ئێمە لە گەڵ حیزب و دەسەلآتی سیاسی بە هیچ جۆرێ لە سەر شتی شەخسی نیە بەڵکو لە سەر جۆری بەرێوەبردنی ولآتەکەیە.

# ئێمە ئەمانەوێ دەستیوەردانی حیزب- مەکتەبەکانی و مەڵبەندەکانی و کۆمیتەکانی

---

★ سایتی سبەی ٢١-٢٣/٩/٢٠٠٨
رۆژنامەی رۆژنامە ٣٠٩-٣١٢ لە٢١-٢٥/٩/٢٠٠٨

- له کاروباری رۆژانەی داوودەزگاکانی حکومەت و زانکۆ و دادگا و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی شارستانی دور بخەینەوە.

ئەوان ئەیانەوێ دەستێوەردانی حیزب لە کاروباری حکومەت و هەمو بوارەکانی ژیانی رۆژانەی خەڵک دا توندتر بکەن.

# ئێمە ئەمانەوێ دادپەوەری لە دابەشکردنی سامانی وڵاتەکەدا، لە دابەشکردنی موچە و زەوی و کاروفرماندا، دابین بکرێ.

ئەوان ئەیانەوێ سامانی وڵاتەکە و کاروفرمان بۆ بەرژەوەندی تایبەتی و زەلیلکردنی خەڵک بە کار بهێنن.

# ئێمە ئەمانەوێ روشنی و ئاشکرایی هەبێ لە کاروباری دارایی و ئابوری و بازرگانی و سیاسی حکومەت دا.

#ئەوان ئەیانەوێ ئەم بابەتانە لە تاریکی دا بە نەزانراوی بمێنێتەوە.

لێرەدا دو پرسیار ئەکەم با خوێنەر خۆی سەرپشک بێ لە وەڵامدانەوەی دا:

یەکەم، ئایا پرۆژەی سیاسی لەمە رۆشنتر و ئاشکراتر ئەوترێ؟

دوەم، ناکۆکیەکانی ئێمە لە سەر شتی شەخسیەیان لە سەر فەلسەفەو شێوەی حوکمڕانیە؟

## ئێمە و ئەوان:
## ناکۆکیەکانمان لە سەر بودجەی هەرێم

بە پێی بڕیاری ٩٨٦ی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان سەبارەت بە پرۆگرامی نەوت بە خۆراک، لە سەردەمی ڕژێمی بەعس دا، پشکی هەرێمی کوردستان لە داهاتی فرۆشتنی نەوت بۆیارمەتی مرۆڤایەی ١٣٪بو. دوای روخانی ڕژێم لە سەردەمی مەجلیسی حوکم دا حاکمی مەدەنی ئەوسای عیراق سەفیر پۆڵ بریمەر لە سەر داوای کورد کردی بە ١٧٪.

١- لە ٢٠٠٣/٧/١ وە تا ٢٠٠٣/١٢/٣١ هەردوو ئیدارەی هەرێمی کوردستان بری (٥٦٧) ملیون دۆلاریان وەرگرتووە بەم شێوەیەی لای خوارەوە :-

دۆلار / ملیون

| | |
|---|---|
| ٢٦١ | ئیدارەی سلیمانی |
| ٣٠٦ | ئیدارەی هەولێر |
| ٥٦٧ | |

٢- لە ساڵی (٢٠٠٤) وە تا ساڵی (٢٠٠٨) ئەو بودجەیەی لە خوارەوە هاتووە بە

ڕێژەی (٥٤٪) بۆ ئیدارەی هەولێر و (٤٦٪) بۆ ئیدارەی سلیمانی تەرخانکراوە :-

تێبینی:

١- ئەم چەردە پاریە بە دۆلاری ئەمەریکی ئەکاتە نزیکەی ٢٣ ملیار دۆلار

٢- ئەم پارەیە تەنیا پشکی هەرێمە لە بودجەی عیراق.

٣- ئەمە جگە لە داهاتی هەرێم و پاشماوەی پارەی پرۆگرامی نەوت بە خۆراک کە بریتی بو لە زیاتر ١ ملیار و ٢٥٠ ملیۆن دۆلار.

لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٤ دا تا ٢٠٠٧ تەرازوی هێزی سیاسی لە ناو عیراق دا بە قازانجی کورد بو. کورد بە هێز بو لایەنە عەرەبیەکانی عیراق هێشتا خۆیان ڕێک نەخستبوەوە لە بەر ئەوە پشکی هەرێم لە بودجەی گشتی عیراق دا لە ئەنجومەنی نوێنەران دا بێ مشتومڕ ئەڕوێنرا.

ساڵی ٢٠٠٨ تەرازوی هێز لە نێوان کورد و لایەنە عەرەبیەکان دا — بە شیعە و سوننەوە- خەریک بو بە قازانجی عەرەب بگۆڕێ. بۆیە لە کاتی تاووتوێ کردنی قانونی بودجەی ساڵی ٢٠٠٨ی عیراق دا هەندێ لایەنی عەرەبی لە ناو «ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق» دا داوایان کرد پشکی هەرێم لە ١٧٪ ەوە کەم بکرێتەوە بۆ کەمتر لە ١٤٪ چونکە بە پێی ئامارەکانی وەزارەتی پلان (وزارە التخطیط)ی بەغداد ڕێژەی دانیشتوانی هەرێمی کوردستان لە چاو هەمو عیراق دا لە ١٤٪ کەمترە.

کیتلەی هاوپەیمانی کوردستان لە «ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق» دا، لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا کە لە بەغداد بوە دو جار هەڕەشەی کشانەوەی کردوە، هەردو جارەکەش ناکۆکیەکە لە سەر پارە بوە نەک لە سەر کێشەی سیاسی:

جاری یەکەم، کە ئەنجومەن ویستی پارەی موچە و دەرماڵەی سەرکۆمار کەم بکاتەوە.

جاری دوەم، کە ئەنجومەن ویستی پارەی ١٧٪ی هەرێم کەم بکاتەوە.

هەردو جار لە بەر هەندێ هۆی سیاسی لایەنە عەرەبیەکان چاوپۆشی‌یان لە داواکەی خۆیان کرد و داواکەی کوردیان سەلماند ڕەنگە ئەم ساڵ کە تەرازوی هێزی ناو ئەنجومەن بە قازانجی عەرەب گۆڕاوە ئەم داوایەی کورد ئیتر سەرنەگرێ.

بودجەی هەرێم دارایی گشتیە، سامانی گەلە، پارەی خەڵکە، ناکۆکیەکانی ئێمە و ئەوان لە سەر بودجە ئەوەیە:

# ئێمە ئەمانەوێ خەڵک بزانێ ئەم بودجەیە و داهاتی تری هەرێم چۆن سەرف کراوە

و بۆ کوێ و بۆ کێ و کەی و بۆ چی و چۆن ڕۆیشتوە.

ئەوان ئەیانەوێ لە تاریکی دا گومی بکەن و لە خەڵکی بشارنەوە.

# ئێمە ئەمانەوێ خەڵک بزانێ بۆچی ئەم بودجە گەورەیە لە باتی ئەوەی ژێرخانی ئابوری هەرێمی پێ بنیات بنرێ و، ببێتە بناغەی ئیکتیفای زاتی کەچی بۆتە هۆی بەسترانەوەی هەرچی بەهێزتری هەرێم بە بەغدادەوە بە تایبەتی بۆ پێویستیە بنچینەییەکانی ژیان لە موچە و خۆراک و سوتەمەنی و دەرمان و کارەبا؟

ئەوان بەم بابەتانە خەڵک ئەترسێنن و، ئەیکەن بە بیانوی هەرچی «تەنازولی سیاسی» زۆرتر بۆ بەغداد و ئەمەریکا.

# ئێمە ئەمانەوێ خەڵک بزانێ مانگانە حیزب چەند ملیار دینار لە بودجەی هەرێم بە نهێنی بۆ خۆی ئەبات

ئەوان ئەم پارانە بۆ دیلکردنی کادرەکانیان و بۆ زەوتکردنی ئازادی فەرمانبەرەکانیان و بۆ شێواندنی ڕێکخراوە «بە ناو» دیمۆکراتیەکان بە کار ئەهێنن.

#

ئاخۆ هاوولاتیەکی ئاسایی ناهەقێتی بڵێ: «بودجەی هەرێم هەرچەندێ بێ، ١٧٪ بێ، کەمتر بێیا زۆرتر بێ، بە من چی؟»

لێرەدا دو پرسیار ئەکەم با خوێنەر خۆی سەرپشک بێ لە وەڵامدانەوەی دا:

یەکەم، ئایا داوا لەمە قانونیتر و ئاشکراتر هەیە؟

دوەم، ناکۆکیەکانی ئێمە لە سەر شتی شەخسیەیا لە سەر ڕۆشنیی داراییە لە داهات و خەرجی هەرێم دا؟

## ئێمە و ئەوان:

## ناکۆکیەکانمان لە سەر بێدادی لە دابەشکردنی موچەدا

سەرچاوەی ژیانی هاوولاتی لە هەر دەوڵەتێک دا بێ لەیەکێ لەم دو بوارەوە دێ: کەرتی تایبەتی و کەرتی گشتی.

ئەوانەی لە کەرتی تایبەتی دا کار ئەکەن هەر لە جوتیار و ئاژەڵداری کەرتی کشتوکاڵەوە تا ئەگا بە خاوەنی کۆمپانیای گەورەی بواری بانک و بازرگانی، خۆیان ئازادن لە جۆری پەیداکردنی پارە و جۆری دابەشکردنەوەی بە سەر موچەخۆرەکانیان دا. بەڵام دەوڵەت بۆ ئەمانیش کۆمەڵێ کۆت و بەندی قانونی داناوە بۆ ئەوەی نەتوانن بە ئارەزوی خۆیان کرێکار و کارمەندەکانیان بچەوسێننەوە لەوانە: ئاشکراکردنی جۆری

پەیدا کردنی سەرمایە و باجی هەڵکشاو و دیاریکردنی کرێی نرخی سەعاتی کار....
ئەوانەی لە کەرتی گشتی دا کار ئەکەن، هەمو ئەو کارمەند و فەرمانبەرانە ئەگرێتەوە کە لە داوودەزگاکانی دەوڵەت دا کار ئەکەن. موچەی ئەمان لە بازاڕی ئازاد و قازانجی کۆمپانیای بازرگانیەوە نایەت بەڵکو لە بودجەی گشتی ئەدرێ کە موڵکی هەمو خەڵکە.
ئەگەر کابرایەکی سەرمایەدار سەربەست بێ لەوەدا کە چۆن جیاوازی لە دەوڵەمەندکردنی کارمەندەکانی پلەی یەکەمی کۆمپانیاکەی دا و لە هەژارکردنی کرێکارەکانی پرۆژەکانی دا دروست بکا، ئەوا حکومەت بە هیچ جۆرێ ئازاد نیە لە خوڵقاندنی جیاوازی چینایەتی لە نێوان کارمەندان و فەرمانبەرەکانی دا وەکو ئەوەی ئیستا لە کوردستانی عیراق دا پێڕەوی ئەکرێ.
لە هەمو ئەو وڵاتانەدا کە دەوڵەت رێز لە کەرامەتی هاووڵاتیەکانی ئەگرێ بەردەوام لێکۆڵینەوە لە سەر بودجەی خێزان ئەکرێ و، بەو پێیە کرێ و نرخ و باج و هەڵئاوسانی دراو دەسکاری ئەکرێ و، دەوڵەت بیمەی بێکاری و نەخۆشی... دابین ئەکا.
ئەبێ جیاوازی چی بێ لە پێویستیە بنەڕەتیەکانی ژیانی پێنج سەر خێزانی وەزیرێک و ژیانی پێنج سەر خێزانی کارمەندێکی هەژاردا؟ بۆچی ئەبێ جیاوازی موچەکەیان ئەوەندە گەورە بێ مانگ لە دوای مانگ لەیەک دور بکەونەوە، لە کاتێک دا سەرچاوەی موچەی هەردوکیان دارایی گشتیە نەک بازاڕی ئازاد.

# ئێمە ئەمانەوێ خەڵک بزانێ بە چ هەقێک و لە سەر چ بنەمایەک موچەی کاربەدەستێکی حکومەتیی پلەی تایبەت نزیکەی ١٠ ملیۆن دینارە، جگە لە نەسریە و ئیمتیازات وشتی تری، کەچی موچەی فەرمانبەری پلەی دەیەمی هەمان حکومەت نزیکەی ١٠٠ هەزار دینارە. لە کاتێک دا لە دەوڵەمەندترین دەوڵەتی دنیادا لە ١٠ جار زیاتر نیە.
ئەوان ئەیانەوێ ئەم ژمارانە لە تاریکی دا بشارنەوە.

# ئێمە ئەمانەوێ موچەی پلەکانی خوارەوە هەڵکشێ بۆ ئاستی دابین کردنی لایەنی کەمی پێویستیە بنەڕەتیەکانی ژیانی خیزان لە هەرێمی کوردستان دا. موچە بەرزەکان و نەسریە و ئیمتیازەکان کەم بکرێتەوە لە بەرامبەردا موچە کەمەکان: کارمەندانی دائیرەکانی حکومەت... بەرز بکرێتەوە.
ئەوان ئەیانەوێ موچەی پلەکانی سەرەوە بەرزتر و نەسریە و ئیمتیازەکانیان زۆرتر بکەن و، موچەی کەمدەرامەتەکان وەکو خۆی بمێنێتەوە.

# ئێمە ئەمانەوێ چاو بە موچەی هەمو پلەکانی کارمەندانی حکومەت دا بخشێنرێتەوە، موچە کۆڵەکەیەکی دابینکردنی ئاشتی کۆمەڵایەتی بێ.
ئەوان ئەیانەوێ موچە ئامرازی سەر پێ دانەواندنی هەژاران و دەستەمۆکردنی کارمەندان بێ.

#

لێرەدا دو پرسیار ئەکەم با خوێنەر خۆی سەرپشک بێ لە وەڵامدانەوەی دا:
یەکەم، کێن ئەوانەی شەڕ لە سەر پارە و دەسەڵات ئەکەن؟
دوەم، ناکۆکیەکانی ئێمە لە سەر شتی شەخسیەیا لە سەر دادی کۆمەڵایەتیە؟

## پاشکۆی ئێمە و ئەوان:

## ناکۆکیەکانمان لە سەر بودجەی هەرێم

ساڵی ١٩٩٩یش وەکو ئێستا باس لە بژار و چاکسازی ئەکرا. وەکو بەشێ لەو پرۆسەیە باس لە دامەزراندنی چەند دەزگایەک ئەکرا لەوانە «ئەنجومەنی پلاندانان».
لە ١٢ی ئابی ١٩٩٩ دا لە کۆبونەوەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا بریاری ئەنجامدانی زنجیرەیەک چاکسازی درا و، بریار درا «ئەنجومەنی پلاندانان» دابمەزرێ. لە گەڵ گۆڕینی کابینەی دوەم و دانانی د بەرهەم ساڵح بە سەرۆکی کابینەی سێیەم ئەبو ئەم دەزگا تازەیەش بکەوێتە کار. ناوکی «ئەنجومەنی پلاندانان» لە چەند وەزیرێک و چەند پسپۆڕێ دامەزرا.
لە تەموزی ١٩٩٩ دا بەیارمەتی و راوێژی چەند پسپۆڕ و شارەزایەک من پرۆژەیەکم دارشت بو بۆ ئیشوکاری ئەو ئەنجومەنە. دوای دامەزراندنی ئەنجومەنەکە پرۆژەکەم پێشکەش کردن. لە بەر ئەوەی لەم وڵاتەدا لێپرسینەوە نیە. ئێستاش نازانم بۆچی ئەنجومەنەکە نەیتوانی هیچ کارێ ئەنجام بدا و نازانم چارەنوسی ئەم پرۆژەیەش چی لێ بەسەر هات.

### ئەمە دەقی پرۆژەکە بو:

ئەنجومەنی پلاندانان (ئە پ)
ستراتیجی ئەنجومەنی پلاندانان بریتیە لە بیناکردنی ژێرخانی کوردستان لە بوارەکانی ئاو، کارەبا، خانوبەرە و رێگەوبان، خۆراک، سوتەمەنی، پەروەردە، تەندروستی، ئاسایشی ناوەکی و دەرەکی.

چوارچێوەی کارەکانی ئەبێ بە جۆرێ بێ کە:

یەکەم، ژمارەی دانیشتوانی ئێستا و تا ١٠ساڵی تری کوردستان و پێویستیەکانیان تقدیر بکا و پلان دابنێ بۆ دابینکردنیان.

دوەم، ژێرخانی کوردستان بە سەربەخۆیی بنیات بنێ تا بتوانێ بە بێ عیراق بژی و بمێنێ.

سێیەم، پرۆژەکانی بڵاو و لامەرکەزی بێ لە شوێنی جیاجیادا دابەش بکرێن بۆ ئەوەی ئەگەر عیراق ویستی تێکی بدا نەتوانێ بۆ نمونە: ئەگەر پرۆژەی ئاوی خواردنەوەی سلێمانی تەنیا ئەو لولانە بێ کە لە ئەستێڵی دوکانەوە راکێشراون، هەر کاتێ حکومەتی عیراق ویستی تێکی بدا بە چەند هێرشێکی ئاسمانی ئەتوانی خراپی بکا و سلێمانی تینو بکا، بەڵام ئەگەر لە هەر گەڕەکێکی سلێمانی دا چەند بیرێکی ئیرتیوازی هەڵبکەنرێ و لە تانکیەکدا لە گەڕەکەکەدا کۆ بکرێتەوە و دابەش بکرێتەوە و، لە هەمان کات دا کارێزە کۆنەکان پاک بکرێنەوە و، لە چەند سەرچاوەیەکی وەکو کانیسکان، چەقچەق، سەرچنار و سەراوی سوبحان ئاغاوە بە بۆری دفنکراو ئاوی بۆ رابکێشرێ، ئاوی خواردنەوەی سلێمانی چەند (بدیل) ێکی ئەبێ و ئەوسا حکومەتی عیراق ناتوانێ بە ئاسانی خراپی بکا.

چوارەم، کەرتی تایبەت بەهێز بکا و تدخلی دەزگاکانی حکومەت لە کاروباری بازرگانی دا بۆ پشتیوانی بێ لە کەرتی تایبەت.

پێنجەم، باج و گومرگ و کری بکا بە سەرچاوەی سەرەکی دەرامەتی حکومەت.

شەشەم، خوێندنگە و پەیمانگە و زانکۆکان بە پێی پێویستیەکانی ئەم ستراتیجە رێک بخاتەوە.

وا لە خوارەوە بۆچونی خۆم لە سەر هەندێ لە کۆڵەکەکانی ژێرخانی کوردستان باس ئەکەم:

## ١. ئاو

١.١. تقدیر کردنی پێویستی ساڵانەی ئاوی خواردنەوە و مەسرەفی ناو ماڵ (بە لیتریان متر مکعب)

١.٢. تقدیر کردنی پێویستی ساڵانەی ئاو بۆ کشتوکاڵ و پیشەسازی (بە لیتریان متر مکعب)

سەرچاوەکانی ئێستا

١.٣. ئاوی سەرزەوی

١.٣.١. کانیەکان

١ . ٣ . ٢ . كارێزەكان

١ . ٣ . ٣ . روبارەكان

- ئەوانەی سەرچاوەكانیان لە كوردستانی عیراق دایە

- ئەوانەی سەرچاوەكانیان لە دەرەوەی كوردستانی عیراقە

١ . ٣ . ٤ . ئەستێڵەكان و ئاوی باران

١ . ٤ . ئاوی ژێرزەوی

- بیری ئیرتیوازی

١ . ٥ . رێكخستنەوەی تۆڕی ئاودانی كشتوكاڵ

١ . ٥ . ١ . هەڵبەستنی جۆگەی نوێ

١ . ٥ . ٢ . دروستكردنی ئەستێڵی نوێ بۆ كۆكردنەوەی ئاوی باران و چەمەكان (وەكو چەقچەق، باسەرە، كەولۆس، تابین، ئاوەسپی، دۆڵەكۆگێ، ماوەت..)

١ . ٥ . ٣ . هەڵكەندنی بیری ئیرتیوازی

١ . ٥ . ٤ . بەكار هێنانی بۆری بۆ راكێشانی ئاوی كشتوكاڵ

١ . ٥ . ٥ . بڵاوكردنەوەی ئاودانی دڵۆپەیی

١ . ٦ . رێكخستنەوەی سەرچاوەكانی ئاوی خواردنەوە

١ . ٦ . ١ . هەر ئاواییەک بە جیا ئاوی (كانی، كارێز، چەم، بیری ئیرتیوازی) بۆ دابین بكرێ

١ . ٦ . ٢ . هەر شارێک بە جیا ئاوی بۆ دابین بكرێ و لە هەر شارێكیش دا گەڕەكەكانی بە جیا ئاویان بۆ دابین بكرێ ( لە كانی، كارێز، چەم، بیری ئیرتیوازی)

١ . ٧ . تقدیر كردنی ژمارەی پیویستی كریكاری ماهیر، فنی و ئەندازیار.

### ٢. كارەبا

٢ . ١ . تقدیركردنی بڕی پیویست بۆ پێویستیەكانی ناو ماڵ

٢ . ٢ . تقدیركردنی بڕی پێویست بۆ پێویستیەكانی كارگە و شوێنە گشتیەكان

٢ . ٣ . سەرچاوەكانی كارەبا

٢ . ٣ . ١ . كارەئاوی

دوكان و دەربەندیخان. پارێزگاری دامەزراوەكانی و، بە كارهێنانی ژێرانەی ئاوی ئەستێڵەكانی

٢ . ٤ . رێكخستنەوەی تۆڕی كارەئاوی

٢ . ٤ . ١ . دامەزراندنی ئیستگەی نوێ

٢ . ٤ . ٢ . ئەو گوندانەی ئاشی ئاویان هەبوە تۆرباینی لێ دابنرێ

٢ . ٤ . ٣ . سەرچاوە گەورەکان تۆربابنیان لە سەر دابنرێ (وەکو سەرچاوەی زەڵم)

٢ . ٤ . ٤ . ئەستێڵە تازەکانی دروست ئەکرێن تۆربابنیان لە سەر دابنرێ

٢ . ٥ . رێکخستنەوەی تۆڕی کارەگەرمی

٢ . ٥ . ١ . هەر شارەو بە ئەندازەی پێویستی خۆی جەنەرەیتەری گەورەی بۆ دابنرێ.

٢ . ٥ . ٢ . هەر کارگەیەک بە ئەندازەی پێویستی خۆی جەنەرەیتەری بۆ دابین بکرێ.

٢ . ٥ . ٣ . هەر شاروچکەیەک و هەر گوندێک بە ئەندازەی پێویستی خۆی جەنەرەیتەری بۆ دابین بکرێ.

## ٣. خۆراک

٣ . ١ . بەرهەمی خۆماڵی

٣ . ١ . ١ . پێویستی ساڵانەی دانیشتوانی ئێستا و پاش ١٠ ساڵی تری کوردستان بە گەنم (بە تەن)

٣ . ١ . ٢ . پێویستی ساڵانەی بە برنج (بە تەن)

٣ . ١ . ٣ . پێویستی ساڵانەی بە پەتاتە

٣ . ١ . ٤ . پێویستی ساڵانەی بە گۆشت

٣ . ٢ . پێویستی ساڵانەی بە خۆراکی لە دەرەوە هێنراو (ئەوانەی لە ناو کوردستان دا قابیلی بەرهەم هێنان نین وەکو شەکر و چا)

٣ . ٣ . پێویستیەکانی بە سایلۆ، عەمار، ساردخانە

٣ . ٤ . تقدیرکردنی مساحەی ئەو زەوییانەی بۆ چاندنی گەنم و برنج و پەتاتە و لەوەڕگای ئاژەڵ پێویستن.

٣ . ٥ . تقدیرکردنی ئاوی پێویست بۆ ئەم بەرهەمانە.

٣ . ٦ . تقدیرکردنی ژمارەی تراکتۆر و کۆمباین و پەمپ و جەنەرەیتەر و هی تر.

٣ . ٧ . تقدیرکردنی بڕی سەمادی پیویست

٣ . ٨ . تقدیرکردنی ژمارەی پیویستی فنی و ئەندازیاری کشتوکاڵ

## ٤. ئاوەدانکردنەوە

٤ . ١ . دێهات

هەر گوندێ بەرەژوری ١٠٠ ماڵ بێ ئەم پێویستییانەی بۆ دابین بکرێ:

٤ . ١ . ١ . ئاوی خواردنەوە (پشت بە سەرچاوەکانی خۆی ببەسترێ کانییان بیر)

٤. ١. ٢. زێراب
٤. ١. ٣. کارەبا (بە ئاوی خۆی ئەگەر نەی بو بە جەنەرەیتەر)
٤. ١. ٤. خوێندنگا
٤. ١. ٥. بنکەی تەندروستی و حەمامی گشتی
٤. ١. ٦. بنکەی کشتوکاڵ و بەیتەرە و گەور لە دەرەوەی گوند
٤. ١. ٧. بنکەی پۆست
٤. ١. ٨. مزگەوت
٤. ١. ٩. خانو بۆ کارمەندەکان
٤. ١. ١٠. رێگای ناو گوندەکە و بەستنەوەی بە مەرکەزی ناوچەکەوە.
٤. ٢. نیشتەجێ‌کردنی ئاوارەکانی دەستی رژێم
٤. ٢. ١. ئاوارەکان ئێستا لە چەند ناوچەی لەیەک دور و دابڕاودا بڵاو بونەتەوە و لە ئەنجامی دەرکرانی بەردەوامیش دا هەر لە زیادبوندان.

٤. ٢. ٢. ئەم ماڵە ئاوارانە چونکە لە شوێنەکانی خۆیان هەڵکەنراون لە ژیانێکی هەژارانەی نائارام و ناخۆش دا ئەژین و، بە هۆی هەژاری و بێکاری و بێ خانویی و بڵاوییەوە توشی چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی قوڵ بون. بۆ ئەوەی لەم ژیانە سەختە رزگار بکرێن و ببن بە هێزێکی بە سود و بەرهەمهێنەر و ببن بە پشتێنەی پاراستنی ئاسایشی کوردستان پێشنیار ئەکەم ئەم پرۆژەیە بۆ نیشتەجێ کردنیان جێبەجێ بکرێ:

٤. ٢. ٣. بە درێژایی خەتی تەماس لە تەقتەق تا کفری زنجیرەیەک ئاواییان بۆ دروست بکرێ (بروانە پاشکۆی ژمارە ١).

٤. ٢. ٤. هەندێ لەم گوندانە ئاوەدان کراونەتەوە بەڵام بچوکن و خەدەماتیان تیا نیە. پێویستە گەشەیان پێ بدرێ و گەورە بکرێن و، لە بۆشایی نێوان ئەم دێیانەدا ئاوایی تازەیان تیا دروست بکرێ.

٤. ٢. ٥. هەر ئاواییەک چەند بیرێکی ئیرتیوازییان بۆ هەڵ بکەنرێ.

٤. ٢. ٦. هەر ئاواییەک بە پێی میقداری ئاوی کشتوکاڵ و مساحەی زەوییەکانی ١٠٠ ماڵ تا ٢٠٠ ماڵی لێ نیشتەجێ بکرێ.

٤. ٢. ٧. هەمو ماڵێکی دانیشتوی ئەم ئاواییانە ئەم پێویستییانەی بۆ دابین بکرێ:
١. خانویەک.
٢. پارچەیەک زەوی بۆ کشتوکاڵ
٣. هەندێ‌یارمەتی ماددی.
٤. پارچەیەک چەک.

٤ . ٢ . ٨ . هەمو ئاوايیەک ئەم ناوەندە خزمەتگوزارییانەی تیا دروست بکرێ:
- پرۆژەی ئاوی خواردنەوە و زێراب و حەمامی گشتی.
- پرۆژەی ئاودانی کشتوکاڵ.
- کارەبای بۆ رابکێشرێ‌یان جەنەرەیتەری بۆ دابین بکرێ.
- بینای قوتابخانەی سەرەتایی.
- بینای بنکەی تەندروستی.
- بینای بنکەی پوست.
- بینای بنکەی کشتوکاڵ.
- بینای بنکەی بەیتەری و گەوڕ لە دەرەوەی گوند.
- مزگەوتێک.

٤ . ٢ . ٩ . ئەم زنجیرە ئاواییە جگە لەوەی ئاوارەکان کۆ ئەکاتەوە و ئەیانکا بە پشتێنەی پاراستنی ئاسایشی کوردستان، هەمیشە چاویان لە ئازادکردنی وڵاتەکەیان ئەبێ و ئاگاداری ئەو گۆڕان و ئاڵوگۆڕانە ئەبن کە لە ناوچەکەیان دا ڕو ئەدەن.

٤ . ٢ . ١٠ . ئەرزی ئەم ناوچانە زۆری ئازادن لە ژێر دەسەڵاتی‌یەکێتی دان. هەندێکی موڵکی حکومەتە و هەندێکی موڵکی دانیشتوانی ناوچەکەن ئەکرێ ئیستیملاک بکرێن و تەعویز بدرێ بە خاوەنەکانی.

تێبینی:
- لە گێرانەوەی ئاوارەکان دا مەبەست ئەوانەیە کە ئێستا بێکار و بێدەرامەتن.
- ئەوانەی ئیشیان هەیە و دەستیان لە کارێک گیر بوە جارێ دەستیان لێ نەدرێ.
- عەشیرەتەکانی: ساڵەیی، شوان، شێخ بزەینی، هەمەوەند، جەباری، قەرە حەسەن، داودە، گل، زەند... ببرێنەوە شوێنەکانی خۆیان. ئەگەر ناوچەکانیان داگیرکراو بو لە ناو ئەرزی عەشیرەتەکانی تردا بە موەقەت نیشتەجێ بکرێن.
- ئەگەر ئەم پرۆژەیە بکرێ بە بەشێ لە بڕیاری ٩٨٦ ئەبێ بخرێتە قاڵبی چارەسەرکردنی موەقەتی کێشەی ئاوارەکانەوە و، باسی ئیعتیباراتی سیاسی و جەنگی و ستراتیجی بشاردرێتەوە.

٢ . ٣ . شار. دروستکردنی گەڕەکی نوێ کە ئەم پرۆژانەی تیا بێ: خانو، زێراب، ئاوی خواردنەوە، کارەبا، تەلەفۆن، پارک، جادە.
٢ . ٤ . موجەمەعی دائیرەکان.
٢ . ٥ . دروستکردنی پردی گەورە و پچوک.
٢ . ٦ . دروستکردنی تۆڕێکی فراوانی ریگە و بان.

### ٥. سوتەمەنی

٥. ١. تقدیرکردنی پێویستیەکانی دانیشتوانی کوردستان بۆ نەوت و گاز و بەنزین.
٥. ٢. گەشەپێدانی شیواشۆک.
٥. ٣. هەڵکەندنی بیری نەوتی نوێ.
٥. ٤. دروستکردنی تانکی و عەمار بۆ هەڵگرتنی نەوت، بەنزین، گازۆیل.
٥. ٥. دانانی نەخشەی راگێشانی لولەی گاز لە ناو شارەگەورەکان

## پرۆژەی نیشتەجێکردنی ئاوارەکانی کەرکوک

١. ئاوارەکانی کەرکوک ئێستا لە چەند ناوچەی لەیەک دور و دابڕاودا بڵاو بونەتەوە و لە ئەنجامی دەرکرانی بەردەوامیش دا هەر لە زیادبوندان. بە پێی سەرژمێرێ تا مایسی ١٩٩٩ ژمارە خیزانیان گەیشتۆتە ١٦ ٦٠٨ ماڵ کە بە سەریەکەوە ٨٨٤٤١ کەسن وەکو لە لیستەی پاشکۆدا رون کراوەتەوە.

٢. ئەم ماڵە ئاوارانە چونکە لە شوێنەکانی خۆیان هەڵکەنراون لە ژیانێکی هەژارانەی نائارام و ناخۆش دا ئەژین و، بە هۆی هەژاری و بێکاری و بێ خانویی و بڵاوییەوە توشی چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی قووڵ بون. بۆ ئەوەی لەم ژیانە سەختە رزگار بکرێن و ببن بە هێزێکی بە سود و بەرهەمهێنەر و ببن بە پشتێنەی پاراستنی ئاسایشی کوردستان پێشنیار ئەکەم ئەم پرۆژەیە بۆ نیشتەجێ کردنیان جێبەجێ بکرێ:

٣. بە درێژایی خەتی تەماس لە تەقتەق تا کفری زنجیرەیەک ئاواییان بۆ دروست بکرێ
لەم شوێنانەی خوارەوە:

٣. ١. ناوچەی شوان: تورکە، حەسەن قەباغ، تورکمانباخ، کارێزە، کاتی قورە، گوڵمکەوە،یەختە خان، عەلی میکائیل، سەیدان، برایم ئاغا، داربەسەر، کڵاوقوت، رەحیمە قوتە، پیریجان، تیمار، گورگان.

٣. ٢. ناوچەی شێخ بزەینی: کانی رەش، مەرزیخە، عەمدون، پەڵکانە، دەرماناوا، کاولەسور، تورکی، جگیلە، قەرەناو.

٣. ٣. ناوچەی قادرکەرەم: نورە، دارتو، تاڵەبان، وەستا خدر، قەیتەوان، گەڕاوی، چەمی روستەم ئاغا، ئیبراهیم غولام.

٣. ٤. ناوچەی کفری: گۆبان، هۆمەریل، بەلەگە، دوڕاجی، پەڵکانە، شۆڕاوە، قەڵا، ئیمام محەممەد، گۆمەیی، میلناسر، چاڵەدوانە.

٣. ٥. ناوچەی کەلار: گردەگۆزینە، چاڵەسێو، سەید ماڵە، سەید حسێن، گاکول.

٣ . ٦ . ناوچەی خانەقین: وەلی ئاغا، بان زەمین، حەوشکورِ.

٣ . ٧ . هەندێ لەم گوندانە ئاوەدان کراونەتەوە بەڵام پچوکن و خەدەماتیان تیا نیە. پێویستە گەشەیان پێ بدرێ و گەورە بکرێن و، لە بۆشایی نێوان ئەم دێیانەدا ئاوایی تازەیان تیا دروست بکرێ.

٤ . هەر ئاواییەک چەند بیرێکی ئیرتیوازییان بۆ هەڵ بکەنرێ.

٥ . هەر ئاواییەک بە پێی میقداری ئاوی کشتوکاڵ و مساحەی زەوییەکانی ١٠٠ ماڵ تا ٢٠٠ ماڵی لێ نیشتەجێ بکرێ.

٦ . هەمو ماڵێکی دانیشتوی ئەم ئاواییانە ئەم پێویستییانەی بۆ دابین بکرێ:

٦ . ١ . خانویەک.

٦ . ٢ . پارچەیەک زەوی بۆ کشتوکاڵ

٦ . ٣ . هەندێیارمەتی ماددی.

٦ . ٤ . پارچەیەک چەک.

٧ . هەمو ئاواییەک ئەم ناوەندە خزمەتگوزارییانەی تیا دروست بکرێ:

٧ . ١ . پرۆژەی ئاوی خواردنەوە و زێراب.

٧ . ٢ . پرۆژەی ئاودانی کشتوکاڵ.

٧ . ٣ . کارەبای بۆ رابکێشرێیان جەنەرەیتەری بۆ دابین بکرێ.

٧ . ٤ . بینای قوتابخانەی سەرەتایی.

٧ . ٥ . بینای بنکەی تەندروستی.

٧ . ٦ . بینای بنکەی پوست.

٧ . ٧ . بینای بنکەی کشتوکاڵ.

٧ . ٨ . بینای بنکەی بەیتەری.

٧ . ٩ . مزگەوتێک.

٨ . ئەم زنجیرە ئاواییە جگە لەوەی کەرکوکییەکان کۆ ئەکاتەوە و ئەیانکا بە پشتێنەی پاراستنی ئاسایشی کوردستان، هەمیشە چاویان لە ئازادکردنی وڵاتەکەیان ئەبێ و ئاگاداری ئەو گۆران و ئاڵوگۆرانە ئەبن کە لە کەرکوک دا رو ئەدەن.

٩ . ئەرزی ئەم ناوچانە زۆری ئازادن لە ژێر دەسەڵاتی‌یەکێتی دان. هەندێکی موڵکی حکومەتە و هەندێکی موڵکی دانیشتوانی ناوچەکەن ئەکرێ ئیستیملاک بکرێن و تەعویز بدرێ بە خاوەنەکانی.

١٠. لە گێرانەوەی ئاوارەکان دا مەبەست جوتیارەکانی دێهاتەکانی دەوری کەرکوکە کە ئێستا بێکار و بێدەرامەتن.

١٠. ١ . ئەوانەی ئیشیان هەیە و دەستیان لە کارێک گیر بوە جارێ دەستیان لێ

نەدرێ.

١٠. ٢. عەشیرەتەکانی: ساڵەیی، شوان، شێخ بزەینی، هەمەوەند، جەباری، قەرە حەسەن، داودە، گل، زەند... ببرێنەوە شوێنەکانی خۆیان. ئەگەر ناوچەکانیان داگیرکراو بو لە ناو ئەرزی عەشیرەتەکانی تردا بە موەقەت نیشتەجێ بکرێن.

١١. ئەگەر ئەم پرۆژەیە بکرێ بە بەشێ لە بریاری ٩٨٦ ئەبێ بخرێتە قالبی چارەسەرکردنی موەقەتی کێشەی ئاوارەکانی کەرکوک و، باسی ئیعتیباراتی سیاسی و جەنگی و ستراتیجی بشاردرێتەوە.

# له كوردستان بڕیاری شەڕ بە دەس کێیە؟★

بڕیاردانی جەنگیەکێکە لە بڕیارە گرنگ و چارەنوسسازەکان. جەنگ هەمیشە دوژمنایەتی و وێرانی و کوشتن و ئاوارەیی و کارەساتی جۆراوجۆر بە دوای خۆی دا ئەهێنێ. جەنگ ئەشێ نەتەوەیەک بەرەو شکستیان بەرەو سەرکەوتن ببات بۆیە لە هیچ جێگایەکی ئەم دنیا پان و بەرینەدا بڕیاردان لە شەڕ بە دەس یەک کەس نیە تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە پاشای مەملەکەتیان دیکتاتۆری وڵات بێت.

لە وڵاتانی دنیادا کە دامەزراوگەلی دەوڵەتیی تێدایە بڕیاردانی جەنگ پرۆسەیەکی ئاڵۆز و پێویستی بە لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی هەمە لایەنە و بەشداری فراوانی دەزگا جۆراوجۆرەکانی دەوڵەت هەیە. تەنانەت ناردنی ژمارەیەکی کەمی سەرباز لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر، ئەگەر بڕیاری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکانیشی لە سەر بێ، بێ لێدوان و ڕەزامەندی پارلەمان جێبەجێ ناکرێ.

تورکیا، حکومەتەکەی و سپاکەی، کە لە ناو زۆرایەتی کوردا بە فاشیستی ناسراوە هەمو جار بۆ لەشکرکێشیەکانی بۆ سەر پەکەکە مۆڵەت لە پارلەمانی وڵاتەکەیان وەرئەگرێ.

لە دەوڵەتی ئیستای عیراق دا ڕاگەیاندنی جەنگ و ڕاگەیاندنی باری نائاسایی ئەبێ بە پرۆسەیەکی دەستوری چەند قۆناغی دا بڕوا: سەرکۆمار و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ئەبێ داوایەکی هاوبەش بدەن بە ئەنجومەنی نوێنەران و ئەنجومەنی نوێنەرانیش بۆ بە دەسهێنانی ڕەزامەندی لە سەر ئەم داوایە پێویستی بە دەنگی دوسێیەکی ئەندامەکانی

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٨/٩/٢٨

ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ٣١٤ لە ٢٠٠٨/٩/٢٨

هەیە.(مادەی ٦١ برگەی نۆیەم: آ لە دەستوری عیراقی).
هەرێمی کوردستان دەوڵەتێکی سەربەخۆ نیە بەڵکو بەشێکە لە دەوڵەتی عیراق و، زۆرایەتی دانیشتوانەکەی دەنگیان بەم دەستورە داوە، لە بەر ئەوە ئەبێ پابەند بێ بەم مادەیەوە. ئەمانە هەموی لە لایەک، لە لایەکی ترەوە ئێمەش لە کوردستان چەندین دەزگا و دامەزراومان هەیە:
سەرۆکایەتی هەرێممان هەیە
ئەنجومەنی وەزیرانمان هەیە
دو وەزارەتی پێشمەرگە و دو «هەیئەتی ئەرکان» دو دەزگای هەواڵگریمان هەیە
دو وەزارەتی کاروباری ناوخۆمان هەیە
ئەنجومەنی نیشتمانی مان هەیە
چەندین مەکتەبی سیاسی حیزبەکان و دو فەرماندەیی حیزبیی پێشمەرگەمان هەیە...

لە پشتی هەمو ئەم داوودەزگایانەوە ئەشێ کەسێ، پلەی هەرچیەک بێ، بە تەنیا بڕیاری شەڕ بدا دژی لایەنێکی تر، ئەو لایەنە هەر کێیەک و هەرکوێیەک بێ؟یا بە ئارەزویەکی سەرەڕۆیانە شەڕێ هەڵگیرسێنێ لایەنێکی هەرێمی کوردستان بێ و لایەنەکەی تری عیراقیا دەوڵەتێکی دراوسێ بێ؟
قەیرانی ئەمجارەی خانەقین بێ باکی و بێ سەروبەری و بێ ئاگایی و بێ بەرنامەیی سەرکردایەتی سیاسی کورد و داوودەزگا قانونی و دەستوریەکانی هەرێمی کوردستانی دەرخست، ئەگینا کەسێیان چەند کەسێ، چەند دەسەڵاتدار و پایەبەرز بن، چۆن ئەتوانن گەلی کوردستانی عیراق بە قسەی ئاگرین و هەڕەشەی بێ سەروپێ لە شەڕێکەوە بگلێنن کە نە حسابی بۆ بەڕێوەبردنی شەڕەکە و نە بۆ ئەنجامەکانی کرد بێ؟

# هەلێکی مێژویی بەڵام لە دەس چو !★

گەلان هەمو جار هەلیان بۆ هەڵ ناکەوێ.
لە دەیان ساڵ خەبات و چاوەڕوانی دا لە زەمان و زەمینێکی دیاریکراودا ئینجا ڕەنگەیەکجار هەلێکی لەبار بۆ گەلێ برەخسێ ئامانجێکی گەورەی خۆی بە دەس بهێنێ. قۆستنەوەی ئەو هەلە لەو زەمان و زەمینەدا کارامەیی و ناکارامەییيان لێ وەشاوەیی و لێ نەوەشاوەیی سەرکردایەتی ئەو گەلە دەرئەخا.
لە پێش ڕوخانی بەعس دا، لە ناو هەموو موعارەزەی عیراقی دا کە ئەوسا هەمویان ئاوارەی وڵاتان بوون و ئێستا لە حوکم دان، کورد بەهێزترینیاریکەری سیاسی مەیدانەکە بو. هێزێکی سیاسی، ئابوری، جەنگی..کاریگەربو. چونکە لەسەر ئەرزی خۆی بو. ئەگەر چی دو حکومەتی هەرێمی کوردستان هەبو بەڵام دەسەڵاتێکی سەربەخۆ بو لە ناو دەوڵەتی عیراق دا.
لەکاتی روخانی بەعس دا، کە هەمو دەزگا و دامەزراوەکانی دەوڵەتی عیراق داڕما بو، بۆشاییەکی ئەمنی، ئیداری، سیاسی لە عیراق دا دروست بوبو، کورد تەنیا هێزی ڕێکخراو بو لە عیراق دا داوودەزگای حکومەتی و حیزبیی هەبو. هەرێمەکەی بۆشایی ئیداری، ئەمنی، سیاسی... تێدا نەبو.
لە دوای ڕووخانی بەعس، کورد لە عیراق دا، لە پاش چەندین ساڵ خەبات و چاوەڕوانی هەلێکی مێژویی بۆ هەڵکەوت، بۆ ئەوەی هەندێ لە خواستە سەرەکییەکانی، بە تایبەتی دیاریکردنی سنوری کوردستان، بچەسپێنێ. ئەگەر لەکاتی خۆی دا

---

★ سایتی سبەی ٢٩/٩/٢٠٠٨

ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ٣١٥ لە ٢٩/٩/٢٠٠٨

بیقۆستایەتەوە لەوانە بو دەسکەوتی سیاسی، دیپلۆماسی، ئابوری پێشمەرگەیی گەورەی بەدەس بهێنایەو، بیتوانیایە هەندێ لە کێشە کۆنەکانی بەلادا بخستایە لەوانە کێشەی سنوری کوردستان، کە ماکی دێرینەی زۆر بە کێشەکانی تری بوە.
سەرکردایەتی کورد، بەهۆی ململانێی حیزبیی ناوخۆیانەوە، بۆ رازی کردنی ئەمەریکا، ئەم هەلەی لە دەس دا.
بەعس کە روخا، لەگەڵ خۆی دەوڵەتی عیراقی بە هەموو دامەزراوە جەنگی، کارگێری، سیاسی، ئابوری، رۆشنبیری، دیپلۆماسیەکانیەوە روخاند. لە عیراق دا شتێ نەمابو نیشانەی هەبونی دەوڵەت بێت. بۆشایی دەسەڵات بە هەمو رەهەندە ئەمنی و سیاسیەکانیەوە دروست بو. خۆشاردنەوە و راوەدونانی کاربەدەستانی دەسەڵاتی رووخاو، چۆڵکردن و تاڵانکرانی داوودەزگاکانی حکومەت، نائەمینی سەرو سامان، نەمانی حکومەت... سەرتاسەری عیراقی ژێر دەسەڵاتی ڕوخاوی بەعسی گرت بوەوە لەوانە هەمو ناوچە کوردستانیە دابڕاوەکانی ژێر دەسەڵاتی بەعس کە لەسەرەتای دروست بونی دەوڵەتی عیراقەوە لە١٩٢١ دا تا ئێستاش لە نێوان کوردو کاربەدەستانی عیراق دا ناکۆکییان لەسەربوە.
لەو پشێویە سیاسی و کارگێریە قوڵەی عیراق دا کە نە لە بەغدادو نەلە هیچ پارێزگایەکی تری عیراق دا دامەزراوەیەکی حکومەتیی نەمابو بەسەر خەڵکەوە حوکمڕانی بکات، بۆشاییەکی گەورە و بەرەڵاییەکی بێ ئەندازە دروست بو، خزمەتگوزاری گشتی هەرەسی هێنابو، سەرکردایەتی کورد، ئەگەر وازی لە ململانێی حیزبی بهێنایەو، بەرنامەیەکی کوردیی نا حیزبیی بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی کارگێری و ئەمنی ئەو ناوچانەو، بۆ دابین کردنی خزمەتگوزارییە بنەڕەتیەکانی جێبەجێ بکردایە، ئەیتوانی هەمویا زۆری ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان، کە ئەوسا بێ خاوەن بون و، چاوەڕێیان ئەکرد حکومەتی هەرێمی کوردستان خۆیان لێ بکات بەخاوەن، وەکو»ئیدارەی ئەمری واقیع»، بیهێنێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی. بەڵام لە باتی ئەمە:
سەرکردایەتی کورد خۆیان چونە بەغداد بۆ جێگیرکردنی جێگە پێی قانونی و سیاسی و ئابوری لە دەوڵەتی عیراقی تازەدا.
لەهەمان کات دا رێگەیان دا بە بەرپرسەکانی ریزی دوەم و سێیەمی حیزبیەکانیان بڕژێنە ئەو ناوچانەوە بۆ داگیرکردنی هەرچی زۆرتری دائیرەو بارەگا و خانوی کاربەدەستانی رژێمی پێشوو، تاڵانکردنی هەرچی زۆرتری سەیارە، بلدۆزەر، شۆفڵ، کەلوپەلی داوودەزگا حکومەتی و حیزبیەکان...
هەلێکی مێژویی کە بۆ کورد هەڵکەوت بو لە دەس چو!

# نوینەرایەتی کورد
# لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراق دا:
# چی کردوە و ئەبو چی بکردایە؟★

کوردستانی عیراق چەندە لە روی جوگرافیای سروشتیەوە جوان و دەوڵەمەندە، ئەوەندە لە روی جوگرافیای سیاسی و بەشەریەوە سەخت و نالەبارە. ئەمەش هەلومەرجی کوردستانی کردوە بە یەکێ لە ئاڵۆزترین کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

کوردستانی عیراق کەوتۆتە ناو سنوری دەوڵەتی عیراقەوە. کورد لە باشترین حاڵەت دا سێ یەکی دانیشتوانی عیراق پێک ئەهێنێ و دوسێ یەکەکەی تری دانیشتوانی عیراق عەرەبن و هەمیشە خۆیان و عیراقیان بە بەشێ لە نەتەوە و نیشتمانی عەرەب ژماردوە. عیراق هاوسنورە لە گەڵ ٤ دەوڵەتی عەرەبی: سوریا، ئوردون، سعودیە، کوەیت و، دو دەوڵەتی ناعەرەبی: تورکیا و ئێران.

عیراق لە ناو هەر یەکێ لەم دەوڵەتانەدا جۆرە درێژاییەکی ئیتنی، دینی، مەزەبیی - مرۆیی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، رۆشنبیری هەیە و، هەر دەوڵەتێکیش لەوانە جۆرە دریژاییەکی لە ناو عیراق دا هەیە. ئەم تێهەڵکێشیە جۆراوجۆرە لە باتی ئەوەی بەرژەوەندی هاوبەش و پێوەندی دامەزراو و دۆستایەتی پتەو بخوڵقێنێ، ناکۆکی قوڵ و ململانێی سەخت و دژایەتی و دوژمنایەتی دروست کردوە.

کوردی عیراق لە ناو ئەم تەنورە داگیرساوەدا ئەژی.

کورد لە لایەکەوە بەشێکە لە دەوڵەتی عیراق. بیەوێیا نەیەوێ بەشدارە لە هەمو کێشەکانی دا و، هاوبەشە لە شەڕ و گێچەڵ و کارەساتەکانی دا، بگرە کورد خۆی یەکێکە لە هۆکارەکانی ئاڵۆزانی پێوەندیەکانی عیراق و دراوسێکانی.

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٨/١٠/٤

رۆژنامەی رۆژنامە ٣١٦ لە ٢٠٠٨/١٠/٥

کورد لە لایەکی ترەوە بەشێکە لە نەتەوەی کورد. هەر بەشێکی ئەم نەتەوەیە لە ناو دەوڵەتێکی دراوسێی عیراق دا ئەژی، ئەو دەوڵەتەش هەمو پێشکەوتنێکی کوردی عیراق بە هەڕەشەی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی و بە مەترسی تێکدانی یەکێتی خاک و دابڕینی بەشێ لە وڵاتەکەی دائەنێ. لە بەر ئەوە یەکسەر دژی ئەوەستێ.

کورد بە هۆی قورسایی دیمۆگرافیەوە بۆ راستکردنەوەی هاوسەنگی نێوان شیعە و سوننەی عەرەب لە عیراق دا لە سەرەتای دروستکردنی دەوڵەتی عیراقەوە هەمیشە بەشدار کراوە لە وەزارەت و داوودەزگا حکومەتیەکان دا بەڵام تا روخانی بەعس هەرگیز وەکو نەتەوەیەکی جیاواز لە عەرەب بەشدار نەبوە لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراقی دا. لە بەر ئەوە نەیتوانیوە رێ بگرێ لەو پلان و پیلانانەی لە دژی رێکخراون. بۆیە هاوبەشیی نوێنەرایەتی کورد، هاوبەشیەکی ئامادە و چالاک، لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراقی تازە دا بۆ گەلی کورد شتێکی چارەنوسساز بو بۆ ئەوەی:

بەشی کورد لە «دەسەڵات و سامان و ئەرز»ی دەوڵەتی عیراق دا دەستەبەر بکا.

عیراق ببێتە سەرچاوەی هێز و پشتیوانی بۆ کورد نەک سەرچاوەی هەڕەشە و لاوازی.

هێز و توانای بەشەری و مادی دەوڵەتی عیراق بۆ پێشکەوتنی گەلی کورد و گەشەکردنی وڵاتەکەی بە کار بهێنێ.

بە شدار بێ لە داڕشتنی بڕیارە گرنگەکان دا بە تایبەتی ستراتیجیەکان و، ئاگادار بێ لە هەمو بڕیارەکان تا لە پشتی ئەوەوە هیچ بڕیارێ نەدرێ و هیچ رێککەوتنێ نەکرێ زەرەری لێ بدا.

ناوەندی دەزگای بڕیاردانی سیاسی دەوڵەتی عیراق لە بەغدادە. کەواتە کورد ئەبو لە بەغداد بێ. لە دوای روخانی رژێمی بەعس، مەجلیسی حوکم دامەزرا، ئەنجومەنی وەزیران پێکهات و کورد هەندێ وەزارەتی گرنگی وەرگرت و لە هەندێ وەزارەتی گرنگی تردا پایەی بەرزی وەرگرت. لە گەڵ پرۆسەکەدا رۆیشت تا پەیکەرەی دەزگاکانی بڕیاردانی سیاسی: سەرۆکایەتی کۆمار، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران و وەزارەتەکانی، سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نوێنەران و ئەندامەکانی، دروست کرایەوە و، لە هەمو ئەمانەدا شوێنی خۆی گرت.

## هەڵەی سیاسی و دەرەنجامی ستراتیجی

ساڵی ١٩٧٠ مەلا مستەفای بارزانی، سەرکردەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد، کەوتۆتە گفتوگۆ لەگەڵ سەرکردایەتی ئەوسای عیراق. کاتێ کە دەستەی نوێنەرایەتی خۆی ناردوە بۆ دانوسەندن لە سەر مافەکانی کورد لەگەڵ نوێنەرانی بەعس لە بەغداد، داوای لێ کردون

ئەوانە بچن بۆ دانوسەندن کە بە تەمای وەرگرتنی هیچ مەنسەب و مەسئولیەتێک نین لە حکومەتی عیراق دا. کەچی ساڵی ٢٠٠٣ سەرکردایەتی کورد دەستەیەکی نوێنەرایەتی راسپارد بۆ دانوسەندن، دەربارەی مافەکانی کورد لە گەڵ لایەنە عەرەبییەکان و لایەنی ئەمەریکی، کە خۆیان بە تەمای وەرگرتنی پۆستی بەرز بون لە حکومەتی عیراق دا. ئەمە جگە لەوەی لە «هونەری دانوسەندن» دا کارێکی نادروستە، هەڵەیەکی سیاسی بو ئەنجامی ستراتیجی لێ کەوتەوە.

لە پاش دامەزراندنەوەی داوودەزگاکانی دەوڵەتی عیراقی تازەوە تا ئیستا (٢٠٠٣-٢٠٠٨) سەرەڕای بەشداری چڕوپڕی نوێنەرایەتی کورد لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراقی دا، قورسایی کورد لە تەرازوی هێزە سیاسییەکان دا گۆڕانی بنەڕەتی بە سەردا هاتوە. بە درێژایی سەردەمی مەجلیسی حوکم و، بە درێژایی سەردەمی وەزارەتی د ئەیاد عەلاوی و، بە درێژایی سەردەمی وەزارەتی د ئیبراهیم جەعفەری و،بە درێژایی ساڵی یەکەمی تەمەنی وەزارەتەکەی نوری مالیکی، تەرازوی هێز لە نێوان کورد و حکومەتی ناوەندی بەغدادا لاسەنگ بو بەڵام بە قازانجی کورد. نوێنەرانی کورد لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراقی دا ئەیانتوانی بەشێ لە خواستەکانی، کە لە قانونی ئیدارەی دەوڵەتی عیراق و لە دەستوری هەمیشەیی دا، سەلمێنرا بو بسەپێنن. شوێنی کورد لە عیراق دا بەهێزتر بکەن و دەسکەوتی سیاسی و ئابوری و دیپلۆماسی و سەربازی باش بۆ هەرێمی کوردستان بە دەس بهێنن. سەرکردایەتی کورد منەت بە سەر کوردا ئەکەن کە هەندێ لە مافەکانی کوردیان ئاخنیوەتە دەستوری عیراقەوە، بەڵام با بزانین کام لەم مافانە لە سەر ئەرز جێبەجێ کراون:

## گێڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکان بۆ سەر هەرێمی کوردستان

ئەیانتوانی پێ دابگرن لە سەر جێبەجێ کردنی مادەی ٥٨ لە وادەی خۆی دا و دوای ئەوەی لەو وادەیەدا جێبەجێ نەکرا ئەیانتوانی پێ دابگرن لە سەر جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠ لە ماوەی دیاریکراوی دەستوری دا.

## یەکسانی زمانی عەرەبی و کوردی

ئەیانتوانی پێ دابگرن لە سەر جێبەجێ کردنی یەکسانی زمانی کوردی و زمانی عەرەبی (مادەی: ٤ لە دەستوری هەمیشەیی عیراق). زمانی کوردی بخەنە سەر هەمو دۆکومێنتەکانی عیراق بە تایبەتی: پارە، پاسپۆرت، هەویەی ئەحوالی شەخسی، پولی پۆستە و مالیە... کە سەنگی مەعنەوی هەیە بۆ تاکی کورد و سەنگی سیاسی هەیە بۆ

نەتەوەی کورد.

## کاروباری جەنگی

ئەیانتوانی بەشداریەکی کاریگەر بکەن لە دارشتنی چوارچێوەی ستراتیجیی «ئاسایشی نیشتمانی و نەتەوەیی عیراق» دا و، پێ دابگرن لە سەر دەستەبەر کردنی پشکی کورد لە وەزارەتی ئاسایشی نیشتمانی و دەزگا موخابەراتیەکانی و وەزارەتی دیفاع و جەیشی عیراق دا. جەیشی عیراق بە جۆرێ دروست بکرێتەوە کە سنوری عیراق بە تایبەتی سنوری کوردستان، پارێزگاری بکا لە دەسدرێژی دەرەکی، نەک بکرێتەوە دەسکەلای دەسەلات بۆ یەکلایی کردنەوەی ناکۆکیە ناوەکیەکان (مادەی ٩ اولا: لە دەستور). لە هەمان کات دا ئەیانتوانی پێشمەرگە لە هێزی پاسەوانی حیزب و سەرکردەکانیەوە بکەن بە هێزێکی رێکوپێکی نیزامیی «پاسەوانی هەرێم»ی کوردستان (مادەی ١٢١ خامسا: لە دەستور).

## کاروباری دەرەوە

ئەیانتوانی بەشداریەکی کاریگەر بکەن لە دارشتنی چوارچێوەی ستراتیجیی «سیاسەتی دەرەکی» عیراق دا و، پێ دابگرن لە سەر دەستەبەر کردنی پشکی کورد لە وەزارەتی دەرەوە و سەفیر و کارمەندی سەفارەتەکانی عیراق دا، لە هەما کات دا «نوێنەرایەتی هەرێمی کوردستان» بۆ کاروباری گەشتوگوزار و رۆشنبیری و گەشەسەندن لە هەمو سەفارەتەکان دا دابمەزرێنن (مادەی ١٢١ رابعا: لە دەستور) و، بەشی کورد لە هەمو نوێنەرایەتی و ناردەکانی عیراق دا بۆ لای رێکخراوە ناودەوڵەتیەکان و کۆڕ و کۆبونەوە جیهانیەکان و، لە «زمالە و بعثاتی دراسی» دابین بکەن (مادەی ١٠٥: لە دەستور).

## کاروباری ئابوری

ئەیانتوانی بەشداریەکی کاریگەر بکەن لە دارشتنی چوارچێوەی ستراتیجیی «سیاسەتی ئابوری» عیراق دا و پێ دابگرن لە سەر دەستەبەر کردنی پشکی کورد (مادەی ١٢١ ثالثا: لە دەستور) لە ئابوری و دارایی و بازرگانی عیراق دا:

لە وەزارەتی دارایی دا بۆ بەشداری لە دارشتنی پرۆژەی قانونی بودجەدا.

لە وەزارەتی نەوت و کانزاکان دا بۆ چاودێری بەرزی و نزمی داهاتی رۆژانەی عیراق و رێککەوتنە نەوتی و غازیەکان.

لە وەزارەتی ئابوری و بازرگانی دا بۆ چاودێری چەردەی داهات و جۆری خەرجی

عیراق و بەشی کورد لە خۆراک و سوتەمەنی دا.

لە هەیئەتی سەربەخۆی چاودیریی بەدەسهێنان و دابەشکرانی دادپەروەرانەی داهات و قەرز و منحە (مادەی ١٠٦: لە دەستور).

## لێپرسینەوە

لە هەرێمی کوردستان هیچ لایەنێکی دەستوری، قانونی، سیاسی، تەنانەت حیزبی، نیە دەسەڵاتی لێپرسینەوەی هەبێ لە گەڵ هیچ کام لە ئەندامانی نوێنەرایەتی کورد لە دەزگای بڕیاردانی سیاسی عیراقی دا.

ئەوانیش ئەوەندەی لە خەمی مسۆگەر کردنی پلە و پایەی بەرز و دەسکەوتی تایبەتی دا بون بۆ خۆیان و خزم و دەسوپێوەندەکانیان ئەوەندە لە خەمی چەسپاندنی مافەکانی کوردا نەبون لە مەیدانی جێبەجێ کردن دا.

ویستەکانی ئەوان هاتە دی خواستەکانی ئێمە کەوتە گەروی نەهەنگەوە!

## پاشکۆ:

مادە پێوەندیدارەکانی دەستوری عیراقی بەم بابەتەوە:

المادة ٤:

اولا: اللغة العربية واللغة الكردية هما اللغتان الرسميتان للعراق، ويضمن حق العراقيين بتعليم ابنائهم باللغة الامكال تركمانية، والسريانية، والارمنية، في المؤسسات التعليمية الحكومية، وفقا للضوابط التربوية، او بأية لغة اخرى في المؤسسات التعليمية الخاصة.

ثانيا : يحدد نطاق المصطلح لغة رسمية، وكيفية تطبيق احكام هذه المادة بقانون يشمل:

أ ـ اصدار الجريدة الرسمية باللغتين

.

ب ـ التكلم والمخاطبة والتعبير في المجالات الرسمية كمجلس النواب، ومجلس الوزراء، والمحاكم، والمؤتمرات الرسمية، بأي من اللغتين

.

ج ـ الاعتراف بالوثائق الرسمية والمراسلات باللغتين واصدار الوثائق الرسمية بهما.

د ـ فتح مدارس باللغتين وفقا للضوابط التربوية.

هـ ـ اية مجالات اخرى يحتمها مبدأ المساواة، مثل الاوراق النقدية، وجوازات السفر، والطوابع.

ثالثا: تستعمل المؤسسات الاتحادية والمؤسسات الرسمية في اقليم كردستان اللغتين

.

رابعا: اللغة التركمانية واللغة السريانية لغتان رسميتان أخريان في الوحدات الادارية التي يشكلون فيها كثافة سكانية.

خامسا: لكل اقليم او محافظة اتخاذ اية لغة محلية اخرى، لغة رسمية اضافية، اذا اقرت غالبية سكانها ذلك باستفتاء عام.

المادة ٩:

اولا:

أـ تتكون القوات المسلحة العراقية والاجهزة الامنية من مكونات الشعب العراقي، بما يراعي توازنها وتماثلها دون تمييز او اقصاء، وتخضع لقيادة السلطة المدنية، وتدافع عن العراق، ولا تكون اداة لقمع الشعب العراقي، ولا تتدخل في الشؤون السياسية، ولا دور لها في تداول السلطة

.

ب ـ يحظر تكوين ميليشيات عسكرية خارج اطار القوات المسلحة.

ج ـ لا يجوز للقوات المسلحة العراقية و أفرادها، و بضمنهم العسكريون العاملون في وزارة الدفاع أو أية دوائر أو منظمات تابعة لها، الترشح في انتخابات لإشغال مراكز سياسية، ولا يجوز لهم القيام بحملات انتخابية لصالح مرشحين فيها، ولا المشاركة في غير ذلك من الاعمال التي تمنعها انظمة وزارة الدفاع، ويشمل عدم الجواز هذا انشطة اولئك الافراد المذكورين آنفا التي يقومون بها بصفتهم الشخصية او الوظيفية، دون ان يشمل ذلك حقهم بالتصويت في الانتخابات.

د ـ يقوم جهاز المخابرات الوطني العراقي بجمع المعلومات، و تقويها للتهديدات الموجهة للأمن الوطني، وتقديم المشورة للحكومة العراقية، ويكون تحت السيطرة المدنية، ويخضع لرقابة السلطة التشريعية، ويعمل وفقا للقانون، وبموجب مبادئ حقوق الانسان المعترف بها.

هـ ـ تحترم الحكومة العراقية، وتنفذ، التزامات العراق الدولية الخاصة بمنع انتشار وتطوير وإنتاج واستخدام الاسلحة النووية والكيميائية والبيولوجية، ويمنع ما يتصل بتطويرها وتصنيعها وانتاجها واستخدامها معدات ومواد وتكنولوجيا وأنظمة للاتصال.

ثانيا: تنظم خدمة العلم بقانون.

المادة ١٠٥:

تؤسس هيئة عامة لضمان حقوق الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم، في المشاركة العادلة في ادارة مؤسسات الدولة الاتحادية المختلفة، والبعثات والزمالات الدراسية، والوفود والمؤتمرات الاقليمية والدولية، وتتكون من ممثلي الحكومة الاتحادية، والاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم، وتنظم بقانون.

المادة ١٠٦:

تؤسس بقانون، هيئة عامة لمراقبة تخصيص الواردات الاتحادية، وتتكون الهيئة من خبراء الحكومة الاتحادية والاقاليم والمحافظات وممثلين عنها، وتضطلع بالمسؤوليات الآتية:

اولا: التحقق من عدالة توزيع المنح والمساعدات والقروض الدولية، بموجب استحقاق الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم.

ثانيا: التحقق من الاستخدام الامثل للموارد المالية الاتحادية واقتسامها.

ثالثا: ضمان الشفافية والعدالة عند تخصيص الاموال لحكومات الاقاليم او المحافظات غير المنتظمة في اقليم، أو وفقا للنسب المقررة.

المادة ١٢١:

اولا : لسلطات الاقاليم، الحق في ممارسة السلطات التشريعية والتنفيذية والقضائية، وفقا لاحكام هذا الدستور، باستثناء ما ورد فيه من اختصاصات حصرية للسلطات الاتحادية.

ثانيا: يحق لسلطة الاقليم، تعديل تطبيق القانون الاتحادي في الاقليم، في حالة وجود تناقض او تعارض بين القانون الاتحادي وقانون الاقليم، بخصوص مسألة لا تدخل في الاختصاصات الحصرية للسلطات الاتحادية.

ثالثا: تخصص للاقاليم والمحافظات حصة عادلة من الايرادات المحصلة اتحاديا، تكفي للقيام بأعبائها ومسؤولياتها، مع الاخذ بعين الاعتبار مواردها وحاجاتها، ونسبة السكان فيها.

رابعا: تؤسس مكاتب للاقاليم والمحافظات في السفارات والبعثات الدبلوماسية، لمتابعة الشؤون الثقافية والاجتماعية والانمائية.

خامسا: تختص حكومة الاقليم بكل ما تتطلبه ادارة الاقليم، وبوجه خاص انشاء وتنظيم قوى الامن الداخلي للاقليم، كالشرطة والامن وحرس الاقليم.

# دوای ئەم هەمو رەخنەیە ئینجا چی؟ *

لە پاش ١٦ ساڵ حوکمڕانی گوێ لە هەر هاوڵاتیەکی کوردستانی بگری بە دەنگی بەرز و بە ئاشکرا ناڕەزایی دەربەبڕێ:

ناڕەزایی دەربەبڕێ لە سەر کەمی خزمەتگوزاری

ناڕەزایی دەربەبڕێ لە سەر خراپیی «ئەدائی» دائیرەکانی حکومەت

ناڕەزایی دەربەبڕێ لە سەر جیاوازی کردن لە نێوان کابرایەکی حیزبی و کابرایەکی ناحیزبی و، لە نێوان حیزبیەک و حیزبیەکی تردا

ناڕەزایی دەربەبڕێ لە سەر بێعەدالەتی

ناڕەزایی دەربەبڕێ لە سەر هەڵسوکەوتی کاربەدەستانی باڵا

ئەم ناڕەزاییە لە ناو هەمو توێژەکانی کۆمەڵ دا لە هەمو بوارەکانی ژیان دا ئەبیسترێ و بە شێوەی جۆراوجۆر دەربەبردرێ:

بە نوسین، لە رۆژنامە و گۆڤار و سایتە ئەلیکترۆنیەکان دا

بە قسە، لە دەمی هاوڵاتی‌یانەوە لە دەزگاکانی بیستن و بینینی راگەیاندن دا: رادیۆ و تەلەفزیۆنی ناوچەیی و سەرتاسەری و ئاسمانی

بە قسە، لە دەمی خەڵکەوە رۆژانە لە ناو بازاڕ و کۆڵان و سەرشەقام و شوێنەکانی کۆبونەوە

بە جولان، مانگرتن و خۆپیشاندانی پچڕپچڕ

بە مانگرتن، لە ناونوسین بۆ دەنگدان لە هەڵبژاردنەکان دا

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٨/١٠/١٢

رۆژنامەی رۆژنامە ٣٢١ لە٢٠٠٨/١٠/١٢

ڕۆژبەڕۆژ گلە و گازندە، سکاڵا، بێزاری، ناڕەزایی، توڕەیی، ڕەخنە، ئاموزولە، تەنانەت جنێو و دوعای شەڕ، زیاد ئەکا، کۆئەبێتەوە و کەڵەکە ئەبێ و ئەبێتە «دیاردەی گشتی» و «خوی کۆمەڵایەتی». سەرەڕای گەورەبونی بەردەوامی ئەم دەرکەوتە مەترسیدارە دەسەڵاتدارانی وڵات، نەئەبیستن و نەئەبینن، نە هیچ هەنگاوێکی جدی ئەنێن بۆ چارەسەرکردنی.

لێرەدا پرسیارێ سەر هەڵئەدا: دوای ئەم هەمو ڕەخنەیە، دوای ئەم هەمو ناڕەزاییە، دوای ئەم هەمو بێدادیە، ئینجا چی و ئەبێ چی بکرێ؟

وەڵامەکان جیاوازن و ئەشێ لە سیناریۆی جیاوازدا بخوێنرێنەوە:

- یەکێ ئەڵێ وازهێنان
- یەکێکی تر ئەڵێ بێدەنگی
- یەکێ ئەڵێ هەوڵی چاکسازی
- یەکێکی تر ئەڵێ هەوڵی گۆڕین

## وازهێنان

هەندێک ئەڵێن، کەمیش نین ئەوانەی وا ئەڵێن، گەندەڵی بۆتە سیستەم، داوودەزگاکانی حیزب و حکومەت گەندەڵی دای ڕزاندون، چارەسەر ناکرێن با واز بێنین بیدەینە دەست ڕۆژگار و چاوەڕێ بین ڕوداوەکانی عیراق و کوردستان بەرەو کوێ ئەڕۆن چونکە:

هەردو دەسەڵات: هەردو حیزب داوودەزگاکانی حکومەتیان زەوت کردوە. سامان و دارایی وڵات، موچەی سەدان هەزار فەرمانبەر، کارمەند، خانەنشین، سوتەمەنی، زەوی، خۆراکی.. خەڵکی وڵاتەکەیان بە دەستە ئەتوانن بیبڕن و خێزان بێدەرامەت بکەن و فڕێی بدەنە سەر جادە.

هەردو دەسەڵات: ئاسایش، پۆلیس، پێشمەرگە، دەزگای نهێنی‌یان هەیە، دادگا و زیندانیان بە دەستە. لە بەر ئەوە خەڵک لێیان ئەترسێ و هەرچی بکەین سودی نیە، کاریگەری نیە، بە ئاسانی ئەتوانن هەرچی جوڵانەوەیەک ببێ سەرکوتی بکەن.

لە بەر ئەوە ئێمە هیچمان پێ ناکرێ چاک وایە سەری خۆمان کز بکەین بێدەنگ بین بزانین چی ئەبێ.

ئەمە جۆرێکە لە بەردانی ورە و بێئومێدی، بێهیوایی، ڕەشبینی... نیشانەی تێشکانی کەسایەتی کورد و داروخانی هەندێ توێژی کۆمەڵایەتیە، کە بێگومان سیستەمی حوکمڕانی و دەسەڵات بەرپرسە لە بەرهەمهێنانی. بەڵام دیاردەیەکی کاتیە درەنگیا زو ئەڕەویتەوە.

## بێدەنگی

هەندێک ئەڵێن: تەجروبەی هەرێمی کوردستان هێشتا جێگیر نەبوە لە بەر مەترسی هەڕەشەدایە، لە ململانێی سیاسیدایە لە گەڵ بەغداد و لە گەڵ وڵاتانی دراوسێدا.
هەندێکی تر لەمە دورتر ئەڕۆن ئەڵێن: پیلان دژی هەرێم هەیە لە بەر ئەوە ئەبێ لە کەموکوڕیەکان بێدەنگ بین، لە ناشیرینەکان چاو بپۆشین، تا لەو پیلانە دەرئەچێ.
ئەمە بیانویەکی کۆنە ١٥ ساڵە ئەوترێتەوە. ئەگەر جاران هەندێ ڕاستی تێدا بوبێ، ئیستا هیچ بنەمایەکی نەماوە نە مەترسی لەشکرکێشی جەنگیی عەرەبی — بەغداد، نە مەترسی لەشکرکێشی جەنگیی ئیرانی — تاران، نە مەترسی لەشکرکێشی جەنگیی تورکی — ئەنقەرە بۆ داگیرکردنی سەربازیی هەرێمی کوردستان لە کایەدا نیە.
ڕەنگە بۆردومانی ئەرزی و ئاسمانی ناوچە سنوریەکان بکەن. ڕەنگە گوشاری سیاسی و ئابوری دروست بکەن. بەڵام ئەمانە قەوارەی دەستوریی و داوودەزگا حکومەتیەکانی هەرێمی کوردستانیان پێ ناروخێ. وڵاتانی دیمۆکراتی کە توشی کێشەی سیاسی گەورە ئەبن بۆ ئەوەی پشتیوانی میللەتەکەیان بە دەس بهێنن هەڵبژاردنی پێشوەخت ئەکەن. حکومەتییەکێتیی نیشتمانی پێک ئەهێنن تا بە ریزی ناوخۆییەککرتوەوە ڕوبەڕوی قەیران ببنەوە. بەڵام دەسەڵاتی کوردی چونکە هەمو شتێکی بۆ خۆی پاوان کردوە و بەمەش میللەتەکەی لە خۆی ڕەنجاندوە، هەمیشە لە هەڵبژاردن و هەمو گۆڕانێکی دیمۆکراتی ئەترسێ. بە هەر جۆرێ بێ ئەیەوێ حکومەتی بە دەستەوە بێ، دەسەڵاتی لە دەس دەرنەچێ، بۆ ئەمەش خەڵک بە هەڕەشەی دەرەکی ئەتۆقێنێ و، وا لە خەڵکی کوردستان ئەکەن بە دایمی لە ترس و دڵەراوکێ دابن و وا تێ بگەن کە ئەگەر ئەوان نەبن عیراق و ئیران و تورکیا ئەیان خۆن.
ئەم قسانە هەندێ لە سودمەندانی گەندەڵی ئەیکەن بۆ سازدانی پشتیوانی رای گشتی لە دەسەڵات و هێشتنەوەی هەلومەرجی ئیستا بە ڕاوەستاوی.

## هەوڵی چاکسازی

هەندێک ئەڵێن: باشترین ڕێ هەوڵدانە بۆ چاکسازی دەسەڵات لە ناو دەسەڵاتەوە بە هۆی دەسەڵاتەوە.
ئەم ڕێگەیە لە هەمو ڕێگەکانی تر سەلامەتتر و ئاسانترە.
سەلامەتترە، چونکە پشێوی سیاسی، ئاژاوەی کۆمەڵایەتی، ڕوبەڕوبونەوەی

چەکداری لێ ناکەویتەوە.

ئاسانترە، چونکە ڕێگەیەکی قانونیە، داوودەزگـا دەستوریەکان ئەتوانن لە پرۆسەیەکی قانونی دا، بە هێمنی و شێنەیی، جێبەجێی بکەن. بەڵام ئەمە پێویستی بەوەیە:

سەرکردایەتی هەردو حیزب، لە ناو ئەوان دا بە تایبەتی هەردو سەرکردەی هەردو حیزب، ئیرادەی چاکسازی‌یان لە ئیرادەی قسەوە لە لا بوبێتە ئیرادەی جێبەجێ کردن. مەکتەبی سیاسی و مەکتەبەکانیان، مەڵبەند و کۆمیتە و لق و ناوچەکانیان قەدەغە بکەن لە دەستێوەردانی ڕۆژانەی هەمو داوودەزگاکانی دەسەڵاتەکانی تەشریعی، تەنفیزی، قەزایی هەروەها لە بازاڕ و زانکۆ و پۆلیس و ئاسایش. میکانیزمی سزادان دابنرێ بۆ هەمو ئەوانەی لەم بڕیارە دەرئەچن، لە هەر پلەیەک دا بن.

وەزارەت حەفتانە کۆ ببێتەوە. وەزیرەکان بەرنامەکانی خۆیان باس بکەن. پرسوڕا بەیەکتری بکەن، ئاگایان لە ئیشەکانییەکتری بێ، لەیەکتری بپرسنەوە. سەرۆکی ئەنجومەن چاودێری جێبەجێ کردنی بەرنامەکانیان بکا

پارلەمان بە ئازادی کار بکا. ئەندامانی پارلەمان لە گەڵ دەنگدەرانی ناوچەکانیان دا تێکەڵاو ببن و کۆببنەوە. بۆیان هەبێ بە ئازادی بدوێن، لە قەفەزی فراکسیۆنی حیزب دەربێن، ئەگەر پێویستی کرد فراکسیۆنی نوێ و ریزبەندی نوێ دروست بکەن. ئەرکە سەرەکیەکانی پارلەمان ئەنجام بدەن:

لێپرسینەوە لە گەڵ وەزیـرەکـان بکەن ئەگەر پێویستی کرد متمانەیان لێ بسێننەوە

بودجەی هەرێم تاووتوێ بکەن و ئاشکرای بکەن بۆ خەڵک

کێشەی ڕۆژانەی خەڵک باس بکەن و بە هاوکاری لە گەڵ حکومەت چارەی بۆ بدۆزنەوە

دەسەڵاتی دادوەری بە هێز بکرێ. بژار بکرێ لە کەسانی نەشیاو. دەرگا بۆ شکات و سکاڵای هاوڵاتی‌یان بکاتەوە. هیچ لایەن و هێچ کەسێ نەتوانێ دەس وەر بداتە کار و بڕیارەکانیانەوە.

دیوانی چاودێری دارایی بە کادری شارەزا بەهێز بکرێ. رابسپێردرێ و دەسەڵاتی بدرێتێ لێکۆڵینەوەی ورد بکا لە سەر هەمو گرێبەستەکان، بێ لێدەرهێنان و شاردنەوە. بە بودجەی هەرێم دا بچیتەوە. نەهێڵێ دارایی گشتی بە فیڕۆ بڕوا. کەموکوڕیەکان بۆ خەڵک ئاشکرا بکا

لە ڕاستی دا ئەمە بە بڕیاری دوکەس و تەنیا بە دو کەس ئەکرێ کە ئەوانیش: مام جەلال و کاک مەسعودن. مام جەلال سەرکۆماری عیراقە، لە هەمان کات دا، سکرتێری

گشتییەکێتیی نیشتمانی کوردستانە. کاک مەسعود، سەرۆکی هەریمی کوردستانە، لە هەمان کات دا، سەرۆکی پارتی دیمۆکراتی کوردستانە.

پێ ئەچێ ئەم دو سەرکردەیە باوەڕیان بەم ڕێگەچاکسازیە نەبێ. لە بەر ئەوە چاوەڕێ کردنی ئەوان کارێکی بێهودەیە. ئەبێ بۆ ڕێگەیەکی تر بگەڕێین.

## هەوڵی گۆڕین

ئەوانەی باسی گۆڕین ئەکەن بیروبۆچونی جیاواز و ڕێگەچارەسەری جیاواز و سیناریۆی جیاواز باس ئەکەن، هەر لە هەوڵی گۆڕینەوە لە ناو حیزب و دەسەڵاتەوە تا زەبروزەنگی شۆڕشگێڕانە و شەڕی چەکدار، تا ڕاپەڕینی جەماوەریی شار و تا بایکۆتی هەڵبژاردن و تا شەڕی هەڵبژاردنەکان و زۆر شتی تر.

## هەوڵی گۆڕین لە ناو دەسەڵاتەوە

هەندێک ئەڵێن: گۆڕین بە تەنیا بە ڕەخنە و نوسین ناکرێ، بۆ ئەوەی گۆڕین بکری ئەبێ بەشداری بکرێ لە دەسەڵاتەکان دا و، هەریەکە لە لای خۆیەوە هەوڵی چاکسازی و گۆڕین بدا.

هەوڵی گۆڕین لە ناو ٣ دەسەڵاتەکەوە: دەسەڵاتی تەنفیزی — ئەنجومەنی وەزیران، دەسەڵاتی تەشریعی — ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان، دەسەڵاتی قەزایی - دادگاکان... واتە هەوڵی گۆڕین لە ناو دەسەڵاتەوە، هەرچەندی وەزیرەکان و پارلەمانتارەکان و دادوەرەکان باش و داواکاری چاکسازییا خوازیاری گۆڕین بن، لە هەلومەرجی ئیستادا، بە هۆی ئەو سیستەمە سیاسیەوە کە لە وڵاتەکەدا پێڕەوی ئەکرێ کارێکە لە کردن نایەت. ئەم دەسەڵاتانە دەسەڵاتی ڕاستەقینەی وڵات نین. لە پشتی ئەمانەوە دەسەڵاتێکی تر هەیە ئەم دەسەڵاتانە بەڕێوە ئەبا و حوکمی وڵات ئەکا، ئەویش «دەسەڵاتی تارمایی» ە کە حیزب و دەستەبەندیەکانی ناو سەرکردایەتیەکانێتی. بۆیە ئەبێ بە تەمای ئەمە نەبین.

## هەوڵی گۆڕین لە ناو حیزبەوە

لەم وڵاتەدا حیزب چۆتە ناو هەمو جومگە و دەمارەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە. حیزب حکومەت دروست ئەکا. حیزبێکی باش حکومەتێکی باش دروست ئەکا حیزبێکی خراپ حکومەتێکی خراپ دروست ئەکا. کەواتە گۆڕین لە ناو حیزب دا بە باری باشە دا ئەبێ بە هۆی گۆڕین لە ناو حکومەت دا بە باری چاکسازی دا.

گۆڕین لە ناو حیزب دا لە کۆنگرە و کۆبونەوە حیزبیەکانی دەزگا باڵاکانی دا ئەکرێ. لە کۆنگرەدا ئەتوانرێ پرۆگرام و دەستوری حیزب و، سەرکردایەتیەکەی بگۆڕێ. بەڵام تەجروبەی دو کۆنگرەی گشتییەکێتی نیشتمانیی کوردستان و، تەجروبەی چەند هەڵبژاردنی ناو ئۆرگانەکانی و هەڵبژاردنی ناو هەردو کۆنگرەکانی دەریان خست، هیوا هەڵچنین لە سەر هەڵبژارنێکی پاک و ئازاد، دور لە پیلانگێڕان و بەکارهێنانی گفت و گەف، بۆ ئەنجامدانی گۆڕانێکی بنەڕەتی لە ناو حیزبەکەدا، ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوی نابێ.

هەمان تاقمی دەسەلاتداری ناو سەرکردایەتی حیزب بە هەمو رێگایەک، تەنانەت بە رێگای بەکارهێنانی تفەنگ، داکۆکی لە مانی خۆی و جێگەکانی و دەسەلاتەکانی و ئیمتیازەکانی ئەکا. دوانگەی ئازاد و بیروبۆچونی جیاواز دەمکوت ئەکا و، باڵی چاکسازی و گۆڕین سەرکوت ئەکا.

حیزب، لە دوای راپەڕینەوە بە هۆی پاوانکردنی دەسەلات و دارایی و دەسکەوت و ئیمتیازەکانیەوە لە لایەن توێژێکی دەسەلاتدارەوە، قابیلی تازە بونەوەیەکی راستەقینە نیە.

کەواتە گۆڕین لەم رێگایەوە ئەگاتە بەردەم دەرگایەکی داخراو.

## هەوڵی گۆڕین لە دەرەوەی حیزب

## حیزب ئامرازەیا ئامانج؟

ئەگەر ئامانج بێ ئەبێ بمێنێ و، ئەگەر ئامرازیش بێ ئەشێ بگۆڕێ و، ئەگەر کەڵکی نەما ئەشێ دەستی لێ هەڵبگیرێ و، ئەگەر رێگەی گرت ئالتەرناتیڤی بۆ دروست بکرێ.

حیزب بێگومان ئامرازە بۆ بەدیهێنانی ئامانج بۆیە ئەبێ لە گەڵ ئامانج دا گونجاو بێ. رەنگە لە قۆناغێکی مێژویی درێژدا ئامانج بە نەگۆڕی بگرە بە پیرۆزی بمێنێتەوە بەڵام ئامراز ئەبێ بە پێی زەمان و زەمین بۆ تەختکردنی رێگەی بەدیهاتنی ئامانج لە گۆڕان دا بێ. کاتێ ئامراز واتە حیزب ناتوانێ ئامانج بەدی بهێنێیا ئەبێتە رێگر لە بەردەم بەدیهاتنی ئامانج دا ئیتر پێویستی بون و مانی لە دەس ئەدا.

راستیی ئەم رێسایە هەروەکو لە سەرانسەری دنیادا سەلماوە، لە کوردستانیش راستە. لە کوردستان زیاتر لە سەد ساڵە ئامانجی کورد و بزوتنەوەکەی نەگۆڕاوە، بەڵام لە هەمو قۆناغەکان دا ئامراز کە حیزبیا هەر رێکخراوێ بوبێ گۆڕاوە، بە تایبەتی کە نەیتوانی بێ لە گەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی بزوتنەوەی کوردا بگۆڕێ و

پێش بکەوێ. بەڵام ئێستا لە کوردستان دا، دوای ئەوەی حیزب قۆناغی شۆڕشی بە جێ هێشت و چوە قۆناغی حوکمڕانیەوە، خەریکە «حیزبپەرستی» لە ناو هەندێ لەوانەدا کە سودمەندن لە حیزب و لە ناو هەندێ لەوانەدا کە لەیاداوەری رابوردودا ئەژین ئەبێتە ئامانج و بیروباوەڕ. سەروەریی رابوردوی حیزب هەرگیز ناتوانێ پاکانە بۆ گەندەڵی و پەککەوتەیی ئێستای حیزب بکا.

مادام گۆڕین لە ناو حیزبەوە ناکرێ و مادام حیزب خۆی بۆتە رێگری گۆڕین و، مادام حیزب ئامانج نیە کەواتە ئەبێ بە دوای گۆڕین دا بگەڕێین لە دەرەوەی حیزب.

## گۆڕینی ئەشخاس یا گۆڕینی سیستەم

هەندێک ئەڵێن:

ئەگەر فلان لابرا و فیسار خرایە جێگەی..

ئەگەر لە سەرکردایەتی حیزب چەند کەسێ لابران و چەند کەسێکی تر چونە جێگایان..

ئەگەر لە ئەنجومەنی وەزیران دا چەند وەزیرێ لابران و چەند کەسێ لە جێگەی ئەوان کران بە وەزیر..

ئیتر بارودۆخەکە ئەگۆڕێ و چاکسازی دەس پێ ئەکا.

لە راستی دا ئەمە جگە لە خۆشباوەڕی شتێکی تر نیە.

سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات لە سەر چەند پایەیەک دامەزراوە لەوانە:

تێکەڵکردنی حیزب و دەزگاکانی جێبەجێکردن ویاسادانان و داوەری

دەسگرتن بە سەر پارە و ئاسایش و پۆلیس و پشمەرگەدا

تاریکاندنی بودجە و، کاروباری ئابوری و دارایی و بازرگانی

تاریکاندنی پێوەندی سیاسی هەرێم و دەرەوە

لە بەر ئەوە کەس، چەندە کەسایەتیەکی بەهێز و دەسەڵاتدار بێ، چاک بێیان خراپ، ئەندامی سەرکردایەتییا وەزیر بێ، رەنگە کاریگەریی هەبێ لە سەر جۆری ئەدائی کارەکەی خۆی و بەردەستەکانی لە شوێنەکەی خۆی دا، بەڵام ناتوانێ کاریگەریی لە سەر تێکڕای سیستەمەکە هەبێ. بۆیە لە بارودۆخی ئێستای کوردستان دا قەیرانەکە لە کێشەی کەس و کەسایەتی دەرچوە و، بە گۆڕینی کەس بارودۆخی کوردستان چاک نابێ، چونکە سیستەمی گشتی وڵاتەکە لە گەڵ ویستی زۆرایەتی کورد ناکۆک و ناساز و لە گەڵ بەرژەوەندی نەتەوەیی کوردا ناگونجێ.

ئەگەر کێشەکە گۆڕین بێ و، گۆڕین لە سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات دا بێ، ئینجا چەندین پرسیاری سەرەکی، بەڵام ئاڵۆز و سەربەگۆبەند، سەر هەڵئەدەن و، هەریەکەیشیان لە لایەن کەس و گروپی جیاوازەوە بە جۆری جیاواز وەڵام ئەدرێنەوە:

- پرسیارییەکەم: گۆڕین چۆن ئەکرێ؟
وەڵام:
- بە بەکارهێنانی توندوتیژی: کودەتا، شۆرش، راپەڕینی جەماوەریی شار
- بە موعارەزەی شارستانی: مانگرتن، خۆپیشاندان، بایکۆتی هەڵبژاردن، بەگژاچونەوەی کاربەدەستان
- بە ململانێی دیمۆکراتی: هەڵبژاردن لە هەمو ئاستەکان دا

- پرسیاری دوەم: گۆڕین بە چی ئەکرێ؟
وەڵام:
- بە دامەزراندنی حیزبێکی نوێ
- بە پێکهێنانی بەرەیەکی فراوانی موعارەزەی ریکخراو
- بە دروستکردنی ئالتەرناتیڤی سەندیکایی
- بە رێکخستنی لیستی جیاواز و موناڤیس لە هەڵبژاردنەکان دا

- پرسیاری سێیەم: گۆڕین لە چی دا ئەکرێ؟
وەڵام:
- لە سیستەمی بەڕێوەبردنی وڵات دا
- لە چەسپاندنی سەروەرییاسادا
- لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دا....

## پرسیارەکان سەختن وەڵامەکانیان سەختترن!

# پرسی کەرکوک:
# کورد لە گەڵ تورکمان چی بکات؟ ★

تورکمان لە نەتەوە کۆنەکانی دانیشتوی ناوچەکەن.

❊

تورکمان لە تەلەعفەرەوە تا مەندەلی لە پارێزگاکانی نەینەوا، هەولێر، کەرکوک، سەلاحەدین، دیالە، واسیت بە چڕی لە هەندێ شوێن و بە پەرتوبڵاوی لە هەندێ شوێنی تر هەن. شریتێکی درێژ پێک ئەهێنن لە سەروی سنوری سوریا- عیراقەوە تا ناوەڕاستی سنوری عیراق — ئێران لە بەینی نەتەوەی کورد و نەتەوەی عەرەب و لە بەینی کوردستان و عەرەبستان دا.

❊

ئەم ناوچانە تێکەڵاون لە گروپی ئیتنی، دینی، مەزەبی جیاواز: کورد، عەرەب، تورکمان، موسوڵمان، مەسیحی، ئێزیدی، شەبەک، شیعە، سوننە، کاکەیی...

❊

ئەم ناوچانە لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقەوە لە نێوان بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و حکومەتی عیراق دا جێناکۆکی بون. سییەکانی سەدەی بیستەم چالاکەکانی کورد داوای دروستکردنی لیوای باجەڵانیان لە ناوچەکانی گەرمیان و لیوای بادینانیان لە موسڵ کردوە.

❊

ئەم ناوچانە وەکو زۆر شوێنی تری کوردستان لە لایەن ڕژیمی بەعسەوە لە شەستەکانی سەدەی بیستەمەوە بۆ گۆڕینی دیمۆگرافی کەوتونەتە بەر هێرشی تەهجیر، تەرحیل، تەعریب

---

★ سایتی سبەی ٢١/١٠/٢٠٠٨

ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ٣٢٩ لە٢٢/١٠/٢٠٠٨

و تەبعیس.

*

ئەم ناوچانە کە بە تێکەڵاو، دابڕاو، داگیرکراو، تەعریبکراو... ناوئەبرێن، هەمویان گرنگن چ بۆ کورد و چ بۆ عەرەب. هەریەکەیان جۆرێ لە گرنگییان هەیە. رەنگە گرنگی شەنگار لە گرنگی خانەقین و گرنگی خانەقین لە کەرکوک کەمتر نەبێ. بەڵام لە ناو ئەوانەدا کەرکوک لە کۆنەوە جێگەیەکی تایبەتی و ناوێکی تایبەتی هەیە بۆتە «دروشم» بۆ بزوتنەوەی کورد و بۆ حکومەتی عیراق.

*

کەرکوک یەکێکە لە گەورەترین مەیدانەکانی نەوتی عیراق و جیهان. پێش یەکەمین جەنگی جیهانی ئینگلیز زانیویتی نەوتی تێدایە. لە ساڵی ١٩٢٧ەوە نەوتی لێ دەرئەهێنرێ و ئەنێردرێ بۆ بازاڕەکانی دنیا. سەرەتا هەمو هەناردەی نەوتی عیراق و دواتر دوای دۆزینەوەی نەوت لە شوێنەکانی تریش تا ساڵی ٢٠٠٣ لە کۆی گشتی هەناردەی نەوتی عیراق ٪٤٠ لە کەرکوکەوە رۆیشتوە.

*

نەوتی کەرکوک لە پشتی لکاندنی ولایەتی موسڵەوە بو بە دەوڵەتی تازەدامەزراوی عیراقەوە و، لە پشتی شکستی شۆڕشەکانی کورد و، سەرنەگرتنی هەوڵ هەڵسوڕاوانی سیاسی کورد بوە.

*

ئیستاش دەستێوەردانی جیاواز لە کێشەی کەرکوک و ناوچە جێناکۆکیەکان دا بەردەوامە لە لایەن:

هێزە عیراقیەکان (بە حکومەت و سونە و شیعەوە)، سوریا، ئوردون، سعودیە،جامیعەی عەرەبی

هێزە ئیقلیمیەکان ئێران و تورکیا

هێزە جیهانیەکان ئەمەریکا و ئینگلیز

رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان و رێکخراوە جیهانیەکانی تر

بەڵام هەتا ئیستاش لە ناو هەمو ئەوانەدا کورد ئەتوانێباریکەری سەرەکی بێ لە کێشەکەدا.

*

لە پاش روخانی رژێمی بەعس هەمو کورد بە تەما بون ناوچە جێناکۆکەکان، بە تایبەتی کەرکوک، بە ئاشتی، بە رێگەی سیاسی و قانونی، بگەڕێنەوە سەر هەرێمی کوردستان. هەر بەو تەمایەوە مادەی ٥٣ و مادەی ٥٨ی قانونی ئیدارەی دەوڵەت و مادەی ١٤٠ی دەستوری

عیراق دانران،بەڵام نە حکومەتی عیراق ویستی و نە کورد توانی لە کاتی دیاریکراودا جێبەجێی بکا.

*

ئێستا کەرکوک لە بەردەم چارەنوسێکی نادیاردایە.

هەر هێزە و سیناریۆیەکی جیاواز، کە لە گەڵ قازانجی خۆی بگونجێ، بۆ کەرکوک دائەنێ:

لایەک، بە تایبەتی بەشێ لە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب، ئەیەوێ کەرکوک، وەکو ئێستا محافەزەیەکی لامەرکەزی بێ لە ژێر دەسەڵاتی مەرکەزیی بەغدادا بمێنێ.

لایەکی تر، بە تایبەتی بەشێ لە تورکمان، ئەیەوێ کەرکوک هەرێمێکی فیدرالی سەربەخۆ بێ.

لایەکی تر، بە تابەتی کورد، گەرەکێتی کەرکوک بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان.

*

ئەم پرۆژەیەی لێرەدا پێشکەش ئەکرێ کە دوای بینین و گفتوگۆ و پرس و راوێژ لە گەڵ چەندین کەس و گروپی کورد و عەرەب و تورکمانی پێوەندیدار لە گەڵ ئەم پرسە ئاڵۆزە ئامادە کراوە، ئەشێ پلاتفۆرمێ بێ بۆ گفتوگۆ لە سەر رێککەوتنی ستراتیجی کورد و تورکمان لە عیراق دا و، ئەشێ بکرێتە مۆدێلێ بۆ گفتوگۆ لە گەڵ عەرەب و کلدۆئاشوری ناوچە تێکەڵاوەکانی کوردستان.

## سەرەتا گشتیەکان

١. کەرکوک لە ناو هەرێمی کوردستان دا دۆخی تایبەتی ئەبێ.

هەمو تورکمانێکی دانیشتوی هەرێمی کوردستان هەمو مافە دەستوریەکانی هاوڵاتی عیراقی و مافە دەستوریەکانی دانیشتوانی هەرێمی کوردستانی هەیە.

٢. هەرێمی کوردستان وەکو لە ناو دەوڵەتی عیراق دا دیفاع لە مافی کوردەکانی دەرەوەی هەرێم ئەکا، هەروەها دیفاع لە مافی تورکمانەکانی دەروەی هەرێمیش ئەکا.

٣. دەستوری هەرێمی کوردستان مافی سیاسی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری تورکمانەکانی دانیشتوی هەرێمی کوردستان دابین ئەکا.

٤. بە قانون بڵاوکردنەوەی بوغزاندنی نەتەوەیی دژی نەتەوە و دین و مەزەبی جیاواز لە راگەیاندنی کوردی دا قەدەغە بکرێ.

٥. بۆ زانینی ژمارەی راستەقینەی کورد و تورکمان و عەرەب و کلدۆئاشوری ئامار ئەنجام ئەدرێ.

### له ئاستی پارێزگای کەرکوک دا

کەرکوک دۆخی تایبەتی ئەبێ:

١. کورد و عەرەب و تورکمان و کلدۆئاشوری بە پێی ڕێژەی خۆیان لە ئەنجومەنی پارێزگادا نوێنەرایەتییان ئەبێ.

٢. ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک دەسەڵاتی لامەرکەزی ئەبێ.

٣. کەرکوک بودجەی تایبەتی خۆی ئەبێ.

٤. لە هەمو ئەو شوێنانەی کە یەکێ لەم پێکهاتانە زۆرایەتین سەرۆکی یەکەی بەڕێوەبەرایەتی و فەرمانگە ناوچەییەکان لەوان ئەبێ.

٥. سەرۆکایەتی داوودەزگا گرنگەکان لە نێوان نەتەوەکان دا نۆرەیی ئەبێ. داوودەزگا گرنگەکانی پارێزگا بریتین لە: سەرۆکایەتی ئەنجومەنەنی پارێزگا، پارێزگار، قایمقام، مدیری ناحیە، سەرۆکایەتی شارەوانی، پەروەردە، بەڕێوەبەرایەتی گشتی پۆلیس، ئاسایش، داوودەزگا نەوتیەکان... هی تر.

٦. زمانی تورکمانی لە پاڵ عەرەبی و کوردی دا زمانی ڕەسمی ئەبێ.

### له ئاستی هەرێمی کوردستان دا

بە پێی ڕێژەی خۆیان بەشیان لە هەمو داودەزگاکانی هەرێم دا ئەبێ: بە تایبەتی لە دەزگاکانی: دەسەڵاتەکانی تەشریعی، تەنفیزی، قەزایی، پاسەوانی هەرێم، نوێنەرایەتی دەرەوە... سەرۆکایەتییەکێ لە ٣ دەسەڵاتەکەی هەرێم بە تورکمان ئەدرێ.

### له ئاستی حکومەتی عیراق دا

بە پێی ڕێژەی خۆیان بەشیان لە هەمو دەزگاکانی عیراق دا ئەبێ. حکومەتی هەرێم پشتیوانییان ئەکا.

# پرۆژەی ئاواکردنەوەی دێهاتی کوردستان*

ئەم پرۆژەیە بۆیە لەم کاتەدا ئەخەمە بەرچاوی کاربەدەستانی حکومەتی هەرێم و ئەنجومەنی نیشتمانیی کوردستان چونکە: یەکەم، هێشتا بودجەی ساڵی ٢٠٠٩ لە کوردستان دوا بڕیاری لێ نەدراوە ئەشێ ئاڵوگۆڕ لە بابەتەکانی دا بکرێ و بەشێ لەم پرۆژەیەی تێکەڵاو بکرێ.

دوەم، بودجەی ساڵی ٢٠٠٩ی عیراق ئەبو ٨٠ ملیار دۆلاری ئەمەریکی بێ بەڵام بە هۆی دابەزینی نرخی نەوتەوە ئەمیش دابەزیوە بۆ ٦٧ ملیار دۆلار. لەم بودجەیە ئەگەر پشکی هەرێم ١٧٪ بێ زیاتر لە ١١ ملیار دۆلاری بەرئەکەوێ و، ئەگەر پشکی هەرێم ١٤٪ بێ زیاتر لە ٩ ملیار دۆلاری بەرئەکەوێ. لە هەردو حاڵەت دا چەردەیەکی ئەوەندە گەورەیە ئەتوانرێ لایەنی کەم ٢٠٪ی کە ئەکاتە کەمێ زیادیا کەم لە ٢ ملیار دۆلار لەم ساڵەوە بۆ جێبەجێکردنی بەشێ لەم پرۆژەیە تەرخان بکرێ.

## سەرەتا:

ساڵی ١٩٧٢ حکومەتی عیراق کەرتی نەوتی «تەئمیم» کرد. بەوە داهاتی عیراق لە نەوت زیادی کرد بەڵام لە ناوەڕاستی حەفتاکان دا کە نرخی نەوت لە بازاڕی دنیادا بەرز بوەوە داهاتی عیراق لە نەوت بوە چەردەیەکی خەیاڵی ئەوتۆ کە ئیتر منەتی بە داهاتی کەرتەکانی تری ئابوری، بە تایبەتی داهاتی کەرتی کشتوکاڵ، نەما.

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٨/١١/٢

ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ٣٣٦ لە٢٠٠٨/١١/٢

رژیمی بەعس لە باتی ئەوەی داهاتی زۆری نەوت بۆ گەشەپیدانی عیراق و بەرزکردنەوەی ئاستی پێشکەوتنی و خۆشکردنی گوزەرانی خەڵک تەرخان بکا، بەشێکی گەورەی بۆ زلکردنی مەکینەی جەنگیی و، برێکی بۆ روخاندنی ئابوری دێهاتی کوردستان تەرخان کرد.

ئابوری دێهاتی کوردستان لە کۆنەوە لە سەر دو کۆڵەکەی سەرەکی راوەستاوە: یەکێکیان کشتوکاڵ و ئەوی تریان ئاژەڵداری بوە. رژیمی بەعس بە شێوەیەکی سیستەماتیک هەردوکیانی روخاند بە مەبەستی ئەوەی ژینگەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و جوگرافی پێشمەرگایەتی تێک بداو، لە ئەنجامی ئەوەش دا دوایی بە شۆڕشی کورد بهێنێ. بە داهاتی نەوت توانی ئەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە روخاندنی کەرتی کشتوکاڵی کوردستان لە ئابوری دانیشتوانی ناوچەکە و لە عیراق دا دروستی کرد.

عەمەلیاتی ئەنفال (١٩٨٨) دوا قۆناغی روخاندنی هەمەلایەنەی ئابوری دێهاتی کوردستان بو، ژیانی تاکی کوردی بە جۆرێ لە بەرهەمهێنەوە گۆڕی بۆ بەرخۆر کە تا ئیستاش بەردەوامە.

سەرنجدانێکی سەرپێیی لە بودجەی هەرێمی کوردستان، دەری ئەخا داهاتی هەرێم لە داهاتی هەمو کەرتەکانی کشتوکاڵ، پیشەسازی، گەشتوگوزار، باج و گومرگ و هی تر، لە چاو داهاتی هەرێم لەو پارەیەی لە بەغداوە دێ ئەوەندە کەمە ئەشێ بوترێ هەرێمی کوردستان شتێکی نیە بچێتە خانەی ئابوری نیشتمانیەوە،یان ئەوەندە لاوازە بە نەبو دائەنرێ. بۆ نمونە بڕوانە ئەم خشتەیە:

داهاتی هەرێم لە ١٢ مانگیساڵی ٢٠٠٧ دا

کۆی داهاتی ناوخۆی هەمو هەرێم بە دینار:

| ملیۆن | بلیۆن | تریلیۆن |
|---|---|---|
| ٧٤٥ | ٢١٦ | ... |

کۆی داهاتی هەرێم کە لە بەغداد وەرگیراوە بە رێژەی:

٥٤٪ بۆ ئیدارەی پێشوی هەولێر

٤٦٪ بۆ ئیدارەی پێشوی سلێمانی

| | ملیۆن | بلیۆن | تریلیۆن |
|---|---|---|---|
| .... | ٣٥٦ | ٩٨٢ | ٥ |

ژیاندنەوەی دێهات و ئاواکردنەوەی گوندەکان و، کاراکردنی کەرتی کشتوکاڵ جگە لە مەبەستی سیاسی، گرنگیەکی گەورەی هەیە لە ئابوری نیشتمانی و، لە بیناکردنەوەی پەیکەرەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵی کوردی و، لە بیناکردنەوەی کەسایەتی بەرهەمهێنەرانەی

مرۆڤی کوردا.

ئاواکردنەوەی دێهات و ژیاندنەوەی ئابوری دێهات سەرمایەی گەورە و ماوەی درێژ و پلانی زانستی درێژخایانی گەرەکە. جاران حکومەت «باج»ی لە جوتیار سەندوە، بەڵام ئێستا و تا چەندەها ساڵی تر بۆ ئەوەی ئابوری دێهات تەندروست بۆ بگەرێتەوە ئەبێ حکومەت «باج» بە جوتیار بدا. حکومەتی هەرێم ئەبێ هەزاران ملیۆن دینار بڕژێنێتە ناو ئابوری دێهاتەوە بێ ئەوەی چاوەڕێی ئەوە بێ بە زویەکی زو، لە ماوەیەکی کورت دا، وەری بگرێتەوە. بەڵام ئەمە ئەبێتە سەرمایەگوزاری درێژخایان بۆ ئاییندە. بنچینەی ئابوری دێهات بەهێز ئەکا و، کاریگەری کەرتی کشتوکاڵ لە پاشەڕۆژێکی نزیک دا لە تێکڕای ئابوری نیشتمانیی کوردستان دا دەرئەکەوێ.

لە هەلومەرجی ئێستادا، لە کوردستان بە هۆی ئەو بودجەیەوە کە لە بەغدادەوە دێ سەرمایە و، بە هۆی هەبونی ئاو و ئەرز و، هەبونی هێزی مرۆیی گەنج و شارەزا، بە کەڵک وەرگرتن لە پسپۆڕ و کۆمپانیای بێگانە، توانای ئەوە هەیە سەرلەنوێ دێهات ئاوەدان بکرێتەوە، بژێنرێتەوە، چالاک بکرێ و بکرێتە بناغەیەکی تۆکمەی داهاتی تاکی جوتیاری کوردستان و سەرچاوەیەکی گرنگی داهاتی نیشتمانی و، دابینکردنی ئاسایشی خۆراک کە یەکێکە لە پایەکانی ئاسایشی نەتەوەیی.

## ئاواکردنەوەی دێهات:

بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی ئاواکردنەوەی دێهات دەستەیەکی باڵا پێک بهێنرێ لە:

سەرۆکی دەستە بە پلەی جێگری سەرووەزیر.

ئەندامەتی وەزیرەکانی دارایی، کشتوکاڵ، ئاوەدانکردنەوە، پلاندانان...

لایەنی کەم ٢٠٪ی داهاتی ساڵانەی هەرێم بۆجێبەجێکردنی تەرخان بکرێ.

ئەم دەستەیە پلانێکی درێژخایانی ئاواکردنەوەی دێهات دائەنێ، دابەشی ئەکا بۆ پلانی ساڵانە، هەر ساڵەی بەشێکی لە شوێنێک دا،یا ئەگەر توانی لە چەند شوێنێک دا، بۆ ئاسانکاری سەرەتا لە ناوچە دەشتاییەکان دا، جێبەجێ بکا.

پرۆژەکە بە قانون لە لایەن ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانەوە پەسند بکرێ.

لیژنەیەکی پارلەمانی بەدواداچونی جێبەجێکردنی بکا.

دەستەی ئاواکردنەوە بەم ڕێگایانە کارەکانی ئەنجام بدا:

### یەکەم: دروستکردنی شاری نوێ:

هەڵبژاردنی شوێنی گونجاوی نزیک لە چەند دێیەک بۆ دروستکردنی شارێکی نوێ.

ئەم شوێنە چاکتر وایەیان خۆی بکرێتە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتییان نزیک بێ لەیەکێ

لە ناوەندە کارگێڕییەکانەوە.

تۆپۆگرافیای شوێنەکە، شاخاوی بێیا دەشتایی، بە کاربهێنرێ بۆ جوانکردنی شارەکە.

نەخشەیەکی گشتی (ماستەر پلان) بۆ دروستکردنی دابنرێ.

فراوانبونی دواڕۆژی لە بەرچاو بگیرێ.

هەوڵ بدرێ کەمترین زەوی کشتوکاڵی خەسار ببێ.

سنوری زەوی نیشتەجێبون و کشتوکاڵ و پاوان و لەوەڕگا لەیەک جیا بکرێتەوە.

خەڵکی دێیەکانی نزیکی هان بدرێن بگوێزنەوە ئەم شارانە.

نەخشەکێشانی شارەکە بە شێوەیەکی زانستی بێ: شەقامی سەرەکی و کۆڵانەکانی و زێرابەکانی، باخچە و شوێنە گشتیەکانی، خانو و فەرمانگە و بازاڕ و دوکانەکانی... بە پێی پلانێکی دانراو دابەش بکرێن.

منداڵانی جوتیارەکان بەهرەمەند بن لەیارمەتی مانگانە تا تەمەنی ١٨ ساڵان.

هەر جوتیارێ تەمەنی گەیشتە ٦٥ ساڵ بەهرەمەند بێ لە مافی خانەنشینی.

شارەکە ئەم بینایانەی تێدا دروست بکرێ:

٤٠٠ — ٥٠٠ خانوی ٢ و ٣ و ٤ و ٥ ژور بۆ دانیشتوانی شارەکە و کارمەندانی فەرمانگەکانی حکومەت.

دروستکردنی ڕێگاوبان بۆ بەستنی شارە تازەکە بە ناوەندی ناوچەکەوە.

کردنەوەی تۆڕی ڕێگاوبان بۆ ناو زەویەکانی دەوروبەری.

پرۆژەی ئاوی خواردنەوە

ئیستگەی کارەبا

بینای ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی

شارەوانی

خوێندنگەی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی

مزگەوت

بازاڕ و بەنزینخانە و میوانخانە

بنکەی تەندروستی

بنکەی ئاسایش

بنکەی پۆلیس

بنکەی پۆست و تەلەفۆن و ئینتەرنێت

بنکەی کشتوکاڵ و کۆگای هەڵگرتنی بەروبوم

بنکەی دروستی ئاژەڵ و گەوڕی گشتی

هۆڵی کۆبونەوە
یاریگە
باخچە

**دوەم: پشتیوانی کشتوکاڵ:**

باخداری - حکومەت ساڵانە بەرامبەر بە خێوکردنی هەر درەختێک بە پێی جۆری دارەکە بۆ مێو، ترش، بادام «رەزانە» و، بۆ هەنار، هەرمێ، هەنجیر، قەیسی، قۆخ، لیمۆ، سێو، پرتەقاڵ، گوێز، زەیتون، بستە... «باخانە» بە جوتیار بدا.

بۆ نمونە رەزانەی ١ بن مێو:.... دینار
رەزانەی ١ بن ترش:... دینار
باخانەی ١ داری زەیتون:... دینار
باخانەی ١ داری گوێز:... دینار

دانەوێڵە - حکومەت ساڵانە بەرامبەر بە چاندنی هەر دۆنمێک ئەرز بە پێی جۆری روەکەکە بە گەنم، جۆ، نۆک، نیسک، ماش، فاسۆلیا، پاقلە، برنج... «زەویانە» بە جوتیار بدا.

بۆ نمونە زەویانەی ١ دۆنم گەنم:... دینار
زەویانەی ١ دۆنم برنج:... دینار
حکومەت بەروبومی ساڵانە بە نرخی هاندراو بکڕێتەوە.

سەوزە - حکومەت ساڵانە بەرامبەر بە چاندنی هەر دۆنمێک ئەرز بە پێی جۆری روەکەکە بە شوتی، کاڵەک، خەیار، ترۆزی، بامیە، تەماتە، باینجان، فاسۆلیا، کولەکە، کاهو، کەلەرم، تور، شێلم، پەتاتە، پیاز، سیر... «زەویانە» بە جوتیار بدا.

بۆ نمونە زەویانەی ١ دۆنم تەماتە:... دینار
زەویانەی ١ دۆنم پەتاتە:... دینار

روەکی پیشەسازی - حکومەت ساڵانە بەرامبەر بە چاندنی هەر دۆنمێک ئەرز بە پێی جۆری روەکەکە بە گەنمەشامی، گوڵەبەڕۆژە، لۆکە، کونجی، کەتان... «زەویانە» بە جوتیار بدا.

بۆ نمونە زەویانەی ١ دۆنم گوڵەبەڕۆژە:... دینار
زەویانەی ١ دۆنم لۆکە:... دینار
حکومەت بەروبومی ساڵانە بە نرخی هاندراو بکڕێتەوە.

**سێیەم: پشتیوانی ئاژەڵداری:**

حکومەت ساڵانە بەرامبەر بە خێوکردنی هەر سەرێ لە مەڕ، بزن، مانگا، گامێش، گوێدرێژ، ئێستر... «شوانانە» بە جوتیار بدا.

بۆ نمونە شوانانەی ١ سەر مەڕ:... دینار

شوانانەی ١ سەر گامێش:... دینار

هەنگداری و مریشکداری بە هەمان شێوە رەفتاریان لە گەڵ بکرێ.

**چوارەم: پشتیوانی بازرگانی:**

حکومەت پشتیوانی لە بەرهەمی خۆماڵی بکا لە بەرامبەر مونافەسەی بەرهەمی دەرەوەدا.

حکومەت کارئاسانی بکا بۆ خاوەنکاری کەرتی تایبەت بۆ هەناردنی بەرهەمی خۆماڵی بۆ بازاڕی دەرەوە.

**پێنجەم: کاراکردنی بانکی کشتوکاڵ:**

دانی قەرز بە جوتیاران بە سودی کەم و ماوەی درێژ بۆ:

دروستکردنی رەز و باخ

راکێشانی جۆگە

هەڵکەندنی بیر

پرۆژەی مریشکداری

دروستکردنی حەوزی پەروەردەکردنی ماسی

پەروەدەکردنی هەنگ و دروستکردنی هەنگەلان

پێکەوەنانی ران و گاگەل

کڕینی تراکتۆر، پەمپ، سەیارە، ئامێری تری کشتوکاڵ

جێبەجێکردنی ئەم پرۆژەیە ئەگەر لە ژێر چاودێری ورد و لێپرسینەوەی بەردەوام دا نەبێ، ئەشێ گەندەڵی دارایی، گەندەڵی کارگێڕی، گەندەڵی سیاسی بەرهەم بهێنێ. بۆ ئەوەی نەبێتە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی گەندەڵی ئەبێ چەند رێوشوێنی قانونی دابنرێ لەوانە:

## نابێ بهێڵرێ ببێتە هۆی بە فیڕۆدانی دارایی گشتی

جێبەجێکردنی ژێرخانی پرۆژەکە پێویستی بە بودجەیەکی گەورە و راپەڕاندنی خێراشی پێویستی بە کەمکردنەوەی کۆسپی بیرۆکراتی هەیە ئەمەش زەمینەی دروستبونی

گەندەڵی دارایی ساز ئەکا بۆیە ئەبێ رێوشوێنی وەها دابنرێ ئەمە نەبێتە سەرچاوەی گەندەڵی دارایی.

دوای تەواوکردنی پرۆژەکەش ئەو داوودەزگایەی بەرپرس ئەبێ لە هەڵسەنگاندن و دانی پارەی پشتیوانی و قەرز بە جوتیارەکان ئەمیش زەمینەی دروستبونی گەندەڵی دارایی ساز ئەکا بۆیە ئەبێ چاودێری و لێپرسینەوەیەکی وایان بە سەرەوە بێ رێ لە روودانی لادانی وەها بگرێ .

## نابێ بهێڵرێ ببێتە هۆی هەڵئاوسانی کارگێڕی

دەزگای بەرێوەبردنی پرۆژەکە لە هەمو ناوەندێکی تازەدا پێویستی بە دەیان فەرمانبەر و کارمەندی بواری جیاجیای خزمەتگوزاری هەیە. ئیستا گرفتێکی کوشندەی دەزگای کارگێڕی هەرێمی کوردستان، کە کاری لە بەر ناڕوا و بۆتە بار بە سەر حکومەت و دارایی گشتیەوە، هەڵئاوسانی کارگێڕی و، زۆریی فەرمانبەر و کارمەندی بێکار و کارنەکەرە، ئەبێ لەم پرۆژەیەدا رێگە نەدرێ ئەم پەتایە دوبارە ببێتەوە، بەڵکو ئەبێ بە کەمترین و لێوەشاوەترین فەرمانبەر و کارمەندی ئیستای حکومەت کارەکان ئەنجام بدا.

## نابێ بهێڵرێ ببێتە گیتۆی حیزبییا گیتۆی خێڵەکی

ئەو ناوچانەی پرۆژەکانی تێدا جێبەجێ ئەکرێ بە زۆری لە ژێر دەسەڵاتیا نفوزی حیزبێک دایە،یا ناوچەی ژیانی عەشیرەتێ، خێڵێ، هۆزێکی دیاریکراوە، نابێ ئەمە ببێتە هۆی دروستکردنی گیتۆیەکی داخراو بۆ ئەوانە. لە دابەشکردنی خانو و کار دا لە شارە تازەکەدا ئەبێ دەرفەتی یەکسان بۆ هەمو دانیشتوانی ناوچەکە بێ گوێدانە ئینتیمای حیزبی، عەشیرەتی، دینی و مەزهەبی، برەخسێنرێ.

پرۆژەی ئاواکردنەوەی دێهات پرۆژەیەکی ستراتیجیە. پێوەندی بە ئیستا و پاشەڕۆژی وڵاتەوە هەیە. رەهەندی ئابوری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و، رۆشنبیری هەیە. بۆ داڕشتن و جێبەجێکردنی نەخشەکەی پیویستی بە سەدان کەسی شارەزا و پسپۆڕی کورد و بێگانەی بواری جیا جیا هەیە. دوای تەواوبونیشی دەیان و بگرە سەدان هەزار کەس لەم ناوەندە تازانەدا ئەژین، بۆیە هەرچی زۆرتر گفتوگۆی لە سەر بکرێ و، بە بیروبۆچونی تازە دەوڵەمەن بکرێ، هێشتا کەمە.

# خوێندنەوەیەکی کوردی بۆ ڕێکەوتنی ئەمەریکی – عیراقی*

ماوەی چەند مانگێکە لە سەر ڕێککەوتنی ئەمەریکی – عیراقی مشتومڕە. ئەم ڕێکەوتنە لە ناو کەسایەتیەکانی عەرەب دا لێدوان و تێچێنی جۆراوجۆر و دژییەکی بە ئاشکرا لە دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا لی کەوتۆتەوە، کەچی لە ناو کوردا کەمترین باسی لێوە کراوە لە کاتێک دا ئەم ڕێکەوتنە ئەوەندەی پێوەندی بە عیراقەوە هەیە ئەوەندەش پێوەندی بە سەلامەتی کوردەوە هەیە.

ئەگەرچی سەرکردەکانی کورد زۆر بە پەرۆشەوە لە قبوڵکردنی ڕێکەوتنەکە دوان و ئەوان وەکو «پارێزەر»ی یەکەمی ریکەوتنەکە دەرکەوتن. پێیان وابوە هەرچی ئەمەریکا بیکا ئەبێ ئەمان بێ قەیدوشەرت پشتیوانی لێ بکەن و بە باشی دابنێن. کەچی زۆرایەتی خەڵکی کوردستان، تەنانەت کەسایەتیە سیاسی و کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیریەکانی، شتێکی ئەوتۆ لە ناوەرۆکی ریکەوتنەکە نازانن. ئەمەش ئەمان باتەوە بۆ پرسێکی گرنگی جوڵانەوەی کورد و جۆری سەرکردایەتی کردنی و بەڕێوەبردنی ململانێ و کێشەکانی، ئەویش نەبونی رونی سیاسی بوە لە پەیوەندیە دەرەکیەکانی: سیاسی، ئابوری، عەسکەری... حکومەتی هەرێم و سەرکردایەتی حیزبەکانی‌دا، لە گەڵ بەغداد و دەوڵەتانی دراوسێ و دنیا کە هەمیشە لە تاریکی دا بوە.

ئەگەرچی دەقی ڕێکەوتنەکە بە زمانی ئینگلیزی و عەرەبی لە چەندین ڕۆژنامە و سایتی ئەلکترۆنی دا بڵاو کراوەتەوە، هەندێ ڕۆژنامەش دەقەکەیان کرد بە کوردی و بڵاویان کردەوە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوڕمان بو کەسانێکی شارەزای کاروباری

---

★ سایتی سبەی ٢٠٠٨/١١/١٢

ڕۆژنامەی ڕۆژنامە ٣٤٤ لە١٢/١١/٢٠٠٨

قانونی، سیاسی، سەربازی، ئابوری، لێیان نەکۆڵیەوە کە ئاخۆ کاریگەری ئەم رێکەوتنە لە سەر ئیستا و پاشەرۆژی کوردستانی عیراق بە ئیستای هەریم و ناوچە دابڕاوەکانیەوە چی ئەبێ.

ئەگەرچی وەزیری کاروباری دەرەوەی عیراق کوردە و، بە پێی ئەو «سیستەمی کۆتا»یەی کە ئەنجومەنی وەزیرانی عیراقی لە سەر دامەزراوە، ئەم بۆتە وەزیری ئەو وەزارەتـەی بەشی کوردبوە، بەڵام گفتوگۆکانی ئەمەریکی — عیراقی دەریان خست هەبونی وەزیری کورد، بە تایبەتی ئەگەر داکۆکی لە بەرژەوەندیەکانی کورد نەکا، لە کابینەکەی بەغدادا هەبێیا نەبێ شتێ لە مەسەلەکان ناگۆڕێ.

گفتوگۆ لە سەر رێکەوتنەکە لە سەرەتاوە بە دەس وەزارەتی دەرەوە بو. وەزیری دەرەوە، بێ ئەوەی زانیاریەکی راست و رۆشن بدا بە رای گشتی عیراقی و کوردی، لە قسەکانی دا هەمیشە بەهاری ئەهێنایە چۆکان. وای دەرئەخست کە رێکەوتنەکە گەیشتۆتە کۆتایی و ها کە ئیمزا کرا. سەرکردەکانی کوردیش وا بە جوانی و بە حەماسەوە داکۆکییان لێ ئەکرد یەکێ شارەزا نەبوایە وای ئەزانی بەڵگەی سەربەخۆیی کوردستانی تێدا رائەگەیەنرێ، تا نوری مالیکی کتوپڕ بە جۆرێ کە لە «سوکایەتی پێ کردن» ئەچو هەمو فایلەکەی لە وەزیر و وەزارەتی دەرەوە سەندەوە، ئیتر خۆی راستەوخۆ کەوتە بەڕێوەبردنی و هەندێ لە ناوەرۆکی رێکەوتنەکە دزەی پێ کرا بۆ دەزگاکانی راگەیاندن.

**لێرەدا چەند راستیەک، رەنگە تاڵ بێ،**
**بەلام پێویستیان بە رونکردنەوە هەیە:**

یەکەم، لە عیراقی فیدراڵی دا کاروباری دیفاع و دەرەوە و دارایی، بە پێی مادەی ١١٠ی «دەستوری هەمیشەیی» کە پارلەمانی کوردستان پەسەندویەتی و زۆرایەتی دەنگدەرانی کورد لە ریفراندۆم دا دەنگی بۆ داوە، لە دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیە. واتە ئەم رێکەوتنەش لە دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیە.

دوەم، ئەم رێکەوتنە و هەر رێکەوتنێکی تری لەم بابەتە، کە عیراق بە پێی مادەی ٢٣ رێکەوتننامەکە بۆی هەیە لە گەڵ دەوڵەتانی هاوبەشی هێزەکانی فرەرەگەز و رێکخراوە ناودەوڵەتیەکان بیکا، کار ئەکاتە سەر ئیستا و پاشەڕۆژی گەلی کورد و هەرێمی کوردستان. لە بەر ئەوە ئەبێ کوردیش لە ئامادەکاری دا بۆ ئەم رێکەوتنانە ئاگادار و بەشدار بێ.

سێیەم، ئەگەر لە شاندێکی وەهـادا، نوێنەری حکومەتی هەرێم، بە دەسەڵاتەوە بەشدار نەبێ، وەزیری دەرەوە کورد بێیا عەرەب، چی لە مەسەلەکە ئەگۆڕێ. بە تایبەتی

ئەگەر ڕێکەوتنەکە سەرەنجام بە دەنگی زۆرایەتی ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق پەسەند کرا. ئەوسا حکومەتی هەرێم و پارلەمانی کوردستان پەسەندی بکەنیا ڕەتی بکەنەوە ئەبێتە کەپەنکی پاش باران.

چوارەم، ناوی دەوڵەتی ئەمەریکا بە «وڵاتەیەککگرتوەکانی ئەمریکا» نوسراوە کەچی لە هیچ مادەیەکی ئەم رێککەوتننامەیەدا ئیشارەت بە فیدرالی بونی دەوڵەتی عیراق نەدراوە و، هەمیشە بە «کۆماری عیراق « و «حکومەتی عیراق» ناو براوە.

ڕەوتی گفتوگۆی رێکەوتنی ئەمەریکی — عیراقی ئەبێ زەنگی هۆشیاری بێ بۆ کورد، ئەگەر وا بڕوا لە رابردودا عیراق پەیمانی سەعدادباد (١٩٣٧)ی لە گەڵ تورکیا و ئێران و، دواتر پەیمانی بەغداد (١٩٥٥)ی لە گەڵ ئێران و تورکیا و، پەیمانی دۆستایەتی و هاوکاری (١٩٧٢)ی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت و، رێککەوتنی جەزائیری (١٩٧٥)ی لە گەڵ ئێران ئیمزا کـردوە، ئیستاش کێ ئەڵێ لە پاشەڕۆژێکی نزیک دا چەندین رێککەوتنی لەو جۆرە لە گەڵ ئێران و تورکیا و سوریا لە پشتی کوردەوە پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی کورد ناکرێ؟ خۆ تا ئیستاش ئێران سورە لە سەر زیندویەتی و کارپێکردنی رێککەوتنی شا — سەدامی جەزائیر (١٩٧٥) کە بە تایبەتی دژی کورد ساز کرا، کەچی وەزارەتی دەرەوەی عیراق هیچ هەنگاوێکی جدی نەناوە بۆ هەڵوەشاندنەوەیا گۆڕینی بە رێککەوتنێکی تر.

## دەربارەی ناوەرۆکی ڕێکەوتنەکە

ئەمەریکا وەکو گەورەترین زلهێزی دنیا هێزەکانی بە سەرانسەری دنیادا بڵاو کردۆتەوە. بۆ رێکخستنی دۆخی قانونی هێزەکانی لەو وڵاتانەدا کە هێزەکانی تێدا ماوەتەوە، لە گەڵ هەر یەکێکیان رێککەوتننامەیەکی ئیمزا کردوە. ئەم جۆرە ڕێکەوتنە بە ناوی ڕێکەوتن لە سەر دۆخی هێزەکان «سۆفا:status of forces agreement»وە، چۆتە ناو فەرهەنگی سیاسیەوە. ئەمەریکا لەم جۆرە ڕێکەوتنەی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە حکومەتەکانی دنیا مۆر کردوە لەوانە دەوڵەتانی ئەندامی ناتۆ،یابان، کۆریا، عەرەبستانی سعودی، عومان، کوەیت، قەتەر، ئیماراتی عەرەبی یەککگرتو... رێککەوتننامەی عیراق — ئەمەریکاش، هەمان «سۆفا»یە، بەڵام عیراق ئەیەوێ ناوی بنێ «رێککەتننامەی کشانەوە».

رەشنوسی «رێککەتننامەی کشانەوە»ی ئەمەریکی – عیراقی پێک هاتوە لە دێباجەیەکی کورت و ٣١ مادە. ئەگەرچی لە هیچ مادەیەکی دا باسی دانانی «بنکەی جەنگی»یا «بنکەی سەربازی» ناکا بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە زۆری مادەکانی بە تایبەتی مادەکانی: ٥ هەتا ٢٤ تەرخان کراوە بۆ رێکخستنی دۆخی سەربازی، سیاسی،

ئابوری، دارایی، تەکنیکی... مانەوە و جوڵان و هاتوچۆ و لەشکرکێشی هێزەکانی ئەمەریکا لە چوارچێوەی قانونی دا لە بنکە سەربازیەکانی خۆیان دا لە سەر ئەرزی عیراق و لە دەرەوەی بنکەکانی خۆیان.

بە پێی مادەی ٣١: ماوەی ٣ ساڵ کار بەم رێکەوتنە ئەکرێ و، بە پێی مادەی ٢٥: هێزەکانی ئەمەریکا ئەبێ تا ٢٠٠٩/٦/٣ لە ناو شار و ئاواییەکانی عیراق بکشێنەوە بنکە سەربازیەکانیان و، تا ٢٠١١/١٢/٣١ لە هەمو عیراق بکشێنەوە، ئەگەر تا ئەوسا ئەم رێکەوتنە هەڵ نەوەشێنرێتەوەیا درێژ نەکرێتەوە.

لێرەدا پێویست ناکا مادەکانی رێکەوتنەکە یەکە یەکە شی بکرێتەوە و، لە باری سەرنجی بەژەوەندی کوردەوە هەڵبسەنگێنرێن، بەڵام ئەوەی پێویستە لێرەدا باس بکرێ، لە بەر چکاوەی تەجروبە تاڵەکانی رابوردوی کوردا، چەند بابەتێکە کە پێوەندیان بە دێباجە و بە چەند مادەیەکەوە هەیە لەوانە: مادەکانی ٤ و ٢٦ و ٢٨ کە ئەشێ مایەی نیگەرانی بن بۆ کورد.

لە دێباجەکەدا ئامانجی رێککەوتنەکە بەمجۆرە رون کراوەتەوە: «... پتەوکردنی ئاسایشی هاوبەش و بەشداری لە ئاشتی و ئاسایشی ناونەتەوەیی و، بەگژاچونەوەی تیرهاب لە عیراق دا و، هاوکاری کردنی یەکتری لە بوارەکانی ئاسایش و بەرگری و، بە هۆی هەمو ئەوانەوە... بەرپەرچدانەوەی هەرەشەکانی لە سەروەری و ئاسایش ویەکێتی ئەرزی عیراق ئەکرێ...»

مادەی ٤: ئەرکەکان

بۆ بەرپەرچدانەوەی هەمو هەرەشەیەکی ناوەکی و دەرەکی دژی کۆماری عیراق و بۆ بەهێزکردنی هاوکاری بۆ تێکشکاندنی تەنزیمی قاعیدە لە عیراق دا و المجموعات الاخری الخارجە عن القانون بۆ ئەو مەبەستە هەردولا، لە سەر بنچینەیەکی کاتی، پێکهاتن لە سەر:

١. حکومەتی عیراق داواییارمەتی کاتی ئەکا لە هێزەکانی وڵاتەیەککرتوەکان کە پشتگیری بکا لە هەوڵەکانی دا بۆ پاراستنی ئاسایش و ئارامی لە عیراق دا، لەوانە هاوکاری بۆ ئەنجامدانی لەشکرکێشی دژی تەنزیمی قاعیدە و گروپە تیرهابیەکان و المجموعات الخارجە عن القانون، لەوانە پاشماوەکانی رژێم.

٢. هەمو ئەو لەشکرکێشییانەی کە بە پێی ئەم رێککەوتنە ئەنجام ئەدرێن، بە موافەقەتی حکومەتی عیراق و هاوئاهەنگی تەواوی دەسەڵاتی عیراقی ئەکرێن. هەمو ئەو لەشکرکێشییانە کۆمیتەیەکی هاوبەش بۆ هاوئاهەنگی سەربازی سەرپەرشتیان ئەکا، کە بە پێی ئەم رێککەوتنە پێک ئەهێنرێ. هەر کێشەیەکی پێوەندیدار بە لەشکرکێشی

پێشنیارکراوەوە کە کۆمیتەی هاوبەشی هاوئاهەنگی نەیتوانی یەکلایی بکاتەوە ئەنێردرێ بۆ کۆمیتەی وەزاری هاوبەش.

٣. هەمو ئەو لەشکرکێشییانە لە گەڵ ڕێزگرتنی تەواوی دەستوری عیراقی وقانونەکانی، جێبەجێکردنیان گونجاو ئەبێ لە گەڵ سەروەری عیراق و بەرژەوەندیە نیشتمانیەکانی، بەوجۆرەی حکومەتی عیراق دیاری ئەکا، ئەرکی هێزەکانی ئەمەریکایە ڕێزی قانون و داب و نەریتەکانی عیراق و قانونی ناودەولەتانی بگرێ.

٤. هەردولا پێک دێن درێژە بدەن بە هەوڵەکانیان بۆ هاوکاری لە پێناوی بەهێزکردنی توانای ئاسایشی عیراق، بەو جۆرەی لە سەری ڕێک ئەکەون، لەوانە مەشق و تجهیز و پشتیوانی و پەیدا کردن و دامەزراندن و نوێکردنەوەی دەزگا لۆجستیەکان (گوێزانەوە و داڵدەدان و ئازوقەدانی سەربازەکان)

٥. ئەم ڕێککەوتنە مافی هەردولا بۆ خۆپاراستن دیاری ئەکا وەکو ئەوەی لە قانونی ناودەوڵەوتی پێوەندیدار دا پێناسە کراوە.

مادەی ٢٨: بەرپەرچدانەوەی مەترسیە ئاسایشیەکان

لە پێناوی پتەوکردنی ئاسایش و ئارامی دا لە عیراق و بەشداری کردن لە درێژەپێدانی ئاشتی و ئارامی ناونەتەوەیی دا، هەردولا بە چالاکی هەوڵ ئەدەن لە پێناوی بەهێزکردنی تواناکانی سیاسی و عەسکەری کۆماری عیراق و توانینی عیراق بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو مەترسییانەی هەڕەشە لە سەروەری و سەربەخۆیی سیاسی و یەکێتی ئەرزی ئەکەن، بۆ ئەو مەبەستە هەردولا بە شێوەیەکی نزیک پێکەوە کار ئەکەن دەربارەی ئەو بابەتانەی پێوەندی‌یان لە گەڵ بەرگری و ئاسایش هەیە، لەو بارەیەوە:

١. لە کاتی دەرکەوتنی هەر مەترسیەکی دەرەکییا ناوەکی دژی عیراقیا ئەگەر دەستدرێژی کرایە سەر، سەروەرییا سەربەخۆیی سیاسی یا یەکێتی ئەرزی یا ئاوی یا ئاسمانی، یا توانای مانەوەی دامەزراوە دیمۆکراتیەکانی پێشێل بکا، لە سەر داوای حکومەتی عیراق، هەردولا دەسبەجێ دەس ئەکەن بە گفتوگۆی ستراتیجی، بەوجۆرەی خۆیان لە سەری ڕێک ئەکەون، ولاتەیەکگرتوەکان ڕێوشوێنی گونجاو ئەگرێ، کە پێکدێ لە کاری دیپلۆماسی و ئابوری و سەربازی،یا هەر تێکەڵەیەکیان، بۆ بەرەنگاری ئەو مەترسی‌یانە.

٢. هەردولا موافەقەت ئەکەن لە سەر درێژەدان بە هاوکاری پتەو بۆ چەسپاندن و بەردەوامی دامەزراوە ئاسایشی و دامەزراوە سیاسی و دیمۆکراتیەکانی عیراق، لەوانە، بە پێی ئەوەی کە خۆیان لە ناو خۆیان دا لە سەری ڕێک ئەکەون، هاوکاری بۆ مەشق و تجهیز و چەکدارکردنی هێزەکانی ئاسایشی عیراق، لە پیناوی شەڕی ئیرهابی ناوخۆیی

و ناودەوڵەتانی والمجموعات الخارجە عن القانون، ئەوەش لە سەر داوای حکومەتی عیراق.

لێرەدا تەنیا ٣ بابەت، کە پێوەندی‌یان بە پرسی کوردەوە هەیە، ئەخرێتە بەر باس:

## یەکەم: کورد و گەرەنتی ناودەوڵەتی

هەندێ کەسایەتی سیاسی عیراق، لەوانە هەندێ لە کاربەدەستە پایەبلندەکانی کە کوردن، نیگەرانی قوڵیان دربڕی لە ئیمزانەکردنی و، مەترسی زۆر گەورەیان ئەخستە بەردەم خەڵکی عیراق وەکو:

ئەمەریکا هێزەکانی لە عیراق ئەکێشێتەوە...

ئینقیلابی عەسکەری ئەبێ...

ئێران دەس وەر ئەداتە هەمو کاروبارەکانی عیراقەوە...

ململانێی دەسەڵات و شەڕی ناوخۆی شیعە - شیعە و، سوننە - سوننە و، شیعە - سوننە و، کورد — عەرەب... ئەقەومێ...

پارەی کەڵەکەبوی عیراق، کە ئیستا سەرۆک بوش پاراستویەتی، لە لایەن خاوەنقەرزەکانەوە تاڵان ئەکرێ...

بە کورتی عیراق ژێروزەبەر ئەبێ!

بەڵام کەسیان باسیان لەوە نەکرد کە نەبونی هیچ گەرەنتیەکی ناودەوڵەتی بۆ پاراستنی کورد لەم رێکەوتنەدا جارێکی تر کورد ئەخاتەوە ژێر مەترسیەکی جدیەوە. بە تایبەتی لە پاشەڕۆژدا ئەگەر هاوسەنگی تەرازوی هێزەکان لە نێوان کورد و حکومەتی ناوەندی بەغدادا بە جۆرێکی بنەڕەتی گۆڕا و، ئەگەر دەسەڵات لە بەغداد جارێکی تر کەوتە دەس هێزێکی قەومی شۆڤێنییا دینیی توندڕەو.

ساڵی ١٩٢١ کە دەوڵەتی عیراق دامەزرا خرایە ژێر ماندات بریتانیەوە. حکومەتی بریتانی عیراقی بەست بوەوە بە چەندین رێکەوتننامەی سەربازی و داراییەوە.

ساڵی ١٩٣٠ کاتێ عیراق ویستی سەربەخۆیی بە دەس بهێنێ و ببی بە ئەندام لە کۆمەڵەی نەتەوەکان دا ئەبو بەریتانیا شایەتی بۆ بدا کە توانای هەیە خۆی بەڕێوە ببات، بەریتانیا لە نرخی ئەم شایەتیەدا داوای ئەکرد کە رێکەوتنە کۆنەکان بە شێوەیەکی تازە دابڕێژنەوە.

رێکەوتنە کۆنەکان هەندێ رستەیان تێدا بو سەبارەت بە سەلماندنی هەندێ لە مافەکانی کورد، چونکە کۆمەڵەی نەتەوەکان بەو مەرجە ولایەتی موسڵ (بەشێکی کوردستانی ئەگرتەوە) خستبوە سەر دەوڵەتی عیراق کە دان بە هەندێ لە مافەکانی کوردا بنێ. رێکەوتنە تازەکەی بەریتانی ـــ عیراقی ئەو مافانەی کوردی پشتگوێ خست

بو، بە بیانوی ئەوەی رێکەوتنەکە کارێکی ناودەوڵەتانیە بەڵام کێشەی کورد کارێکی ناوخۆی عیراقیە.

چالاکەکانی کورد لەو سەردەمەدا لە رێگەی ناردنی عەریزە و مەزبەتە ویادداشت و بروسکەوە بۆ حکومەتی بەریتانی و حکومەتی عیراق و کۆمەڵەی نەتەوەکان و، لە رێگەی خۆپیشاندان و گفتوگۆی روبەڕو لە گەڵ نوێنەرانی عیراقی و بەریتانیەوە داوایان کرد جۆرێ لە گەرەنتی سەبارەت بە دابینکردنی مافەکانی کورد لەو رێکەوتنەدا بنوسرێ، چونکە ترسی ئەوەیان هەبو حکومەتی عیراق لە پاشەڕۆژدا وەک چۆن تورک ئەرمەنی قڕ کردوە، ئەوانیش کورد لە عیراق دا قڕ بکەن. بەڵام هەوڵ و تەقەلای چالاکەکانی کورد سەرەنجام لە خوێناوی قوربانیەکانی شەشی رەشی ئەیلول (١٩٣٠) و لە زیندانەکانی عیراق دا خنکا.

دوای ئەوەی عیراق پەلاماری کوەیتی دا و داگیری کرد کۆمەڵگای ناودەوڵەتی بە دەنگ هات و ئەنجومەنی ئاسایشی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان بریاری ٦٦١ (١٩٩٠)ی دا و، بە دوای ئەویش دا زنجیرەیەک بریاری دا لەوانە بریارەکانی ٦٨٧ (١٩٩١)، ٦٩٩ (١٩٩١)، ٧٠٧ (١٩٩١)، ٧١٥(١٩٩١)، ١٠٥١(١٩٩٦)، ١٢٤٨(١٩٩٩)، ١٤٤١ (٢٠٠٢)، ١٤٨٣ (٢٠٠٣)، ١٥٤٠ (٢٠٠٤)... کە عیراقی خستە ژێر زەبری «بەندی حەوتەم»ی پەیمانی نەتەوەیەکگرتوەکانەوە، کە ئەگەر بە ئاشتی لە کوەیت نەکشێتەوە بە زۆری هێز دەری بکەن و ئەگەر بە خۆشی بریارەکانی کۆمەڵگای ناودەوڵەتی جێبەجێ نەکرد بە زۆر بە سەری دا بسەپێنن. هێز بە تەنیا بەکار هێنانی چەک نەبو، بەڵکو زنجیرەیەک سزای قورس و بریاری کاریگەر بو، سەرەنجام کوردیش وەکو میللەتی کوەیت کەڵکی لە هەندێکیان وەرگرت.

هەر لە ئەنجامی ئەو روداوانەدا چەند بریاری گرنگ دەربارەی کورد درا لەوانە:

بریاری ٦٨٨ (١٩٩١) دەربارەی دامەزراندنی پەناگای ئەمین بۆ کورد.

بریاری ٩٨٦ (١٩٩٥) دەربارەی دیاریکردنی بەشی کورد لە پرۆگرامی نەوت بە خۆراک دا.

ئێستا یەکێ لە بیانوەکانی کاربەدەستانی عیراق و ئەمەریکی بۆ ئیمزاکردنی ئەم رێکەوتنە، وەکو لە مادەی ٢٦ دا رون کراوەتەوە، دەرهێنانی عیراقە لە ژێر باری بریارەکانی بەندی حەوتەم و ئەنجامەکانی.

کوردی عیراق چ قازانجێ ئەکا لە ئازادکردنی عیراق لە کۆتوپێوەندی ئەو بریارانە؟ ئەگەر ئەم کۆتو پێوەندە ناودەوڵەتییانە و، چاودێری ناودەوڵەتی نەمێنێ و حکومەتی عیراق سەربەخۆیی تەواو وەربگرێتەوە چ گەرەنتیەک بۆ پاراستنی کورد هەیە؟ ئەگەر بڵێن دەستوری هەمیشەیی! خۆ چەندین مادە لە دەستوردا هەیە سەبارەت بە مافەکانی

کورد لەوانە مادەی ١٤٠ بەڵام کامیان جێبەجێ کراوە و، گەرەنتی چیە بۆ جێبەجێ کردنیان؟

لەم ڕێکەوتنەدا هیچ دڵنیاییەک بە کورد نەدراوە کە حکومەتی عیراق هاوکاری عیراقی – ئەمەریکی لە پاشەڕۆژدا دژی کورد بە کار ناهێنێ و ڕێگە بە هێزە چەکدار و ئەمنیەکانی عیراق نادا تاوانی جینۆساید دژی کورد و هیچ گروپێکی ئیتنی و دینی دوبارە بکاتەوە.

## دوەم: کورد و «المجموعات الخارجە عن القانون»

لەم ڕێککەوتنەدا ٣ جار باس لە «مجموعات خارجە عن القانون» کراوە. مادەی ٤ نوسیویێتی:

«بۆ بەرپەرچدانەوەی هەمو هەڕەشەیەکی ناوەکی و... تەنزیمی قاعیدە و المجموعات الخارجە عن القانون...»

جارێکی تر لە برگەی یەکەمی هەمان مادەدا نوسیویێتی:

«حکومەتی عیراق داواییارمەتی ئەکا... دژی المجموعات الخارجە عن القانون»

ڕێکەوتنەکە جارێکی تر لە برگەی دوەمی مادەی ٢٨ دا نوسیویێتی:

«هەردولا موافەقەت ئەکەن... لە پێناوی شەڕی تێرۆری ناوخۆیی و ناودەوڵەتی و المجموعات الخارجە عن القانون...»

کاتێ کە مادەی ٢٤ی قانونی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان سەبارەت بە کەرکوک ناکۆکی لە ناو پارلەمانی عیراق دا دروست کرد و، سەرۆکایەتی کۆمار قانونەکەیان رەت کردەوە، نوری مالیکی، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عیراق، لە تۆڵەی ئەوەدا بە بیانوی شەڕی تێرۆریزمەوە جەیشی عیراقی لە ژێر ناوی «عەمەلیاتی بەشائیرولخەیر» دا ناردە پارێزگای دیالە بۆ دەرکردنی هێزەکانی کورد (پێشمەرگە، ئاسایش، پۆلیس، بارەگای حیزبە کوردیەکان) لە جێناکۆکەکانی قەزای خانەقین: سەعدیە، جەلەولا، تەبەج، حەمرین، قەرەتەپە، جەبارە... کاتێ نوێنەرانی هەرێمی کوردستان رۆژی ١٥ی ٨ی ٢٠٠٨ بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەکە چونە بەغداد بە راشکاوی ئاگاداری کردن کە بونی هێزەکانی کورد لە دەرەوەی سنوری هەرێمی کوردستان «ناقانونیە» و مانەوەیان بە «دەرچون لە قانون» دائەنرێ و، چۆن رەفتاری لە گەڵ «جەیشی مەهدی» کردوە بە هەمان شێوە رەفتار لە گەڵ ئەمانیش ئەکا.

ئەگەرچی نوێنەرانی کورد ئەم هەڕەشەیەیان بە خەڵکی نەگوت بەڵام بە دوای مالیکی دا چەندین کەسایەتی سیاسی عیراقی هەمان قسەیان بە شێوەی جۆراوجۆر لە

دەزگاکانی ڕاگەیاندن دا دوبارە کردەوە، لەوانە:

د هومام حەمودی، ئەندامی سەرکردایەتی مەجلیسی ئیسلامی ئەعلا، نوێنەری پارلەمان لە لیستی ئیئتیلافی شیعە دا، لە وتارێک دا لە بەردەمی کۆنفرەنسی «×ادقون» دا لە تاران.

عەلی ئەدیب، ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی دەعوە و نوێنەری پارلەمان لە لیستی ئیئتیلافی شیعە، لە گفتوگۆیەک دا لە گەڵ ڕۆژنامەی شەرقی ئەوسەتی لەندەنی و لە گەڵ دەزگاکانی ڕاگەیاندنی عیراقی دا.

د حەیدەر عەبادی ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی دەعوە و نوێنەری پارلەمان لە لیستی ئیئتیلافی شیعە لە قەناتە عیراقیەکانەوە.

سامی عەسکەری، ڕاوێژکاری سەروەزیر و نوێنەری پارلەمان لە لیستی ئیئتیلافی شیعە دا، لە گفتوگۆیەک دا ڕۆژی ٣٠ی ٨ی ٢٠٠٨ لە گەڵ «ڕادیۆی سەوا» لە هەمویان رونتر و ڕەوانتر وتی:

عەرەبیەکەی: «ان رئيس الوزراء نوری المالکی ابلغ القيادات الکرديه بان تواجد قوات البيشمرگه خارج اقليم کردستان سيعرضها للملاحقه القانونيه... ان المالکی ابلغ القيادات الکرديه ايضا ان وجود قوات البيشمرگه خارج الخط الازرق فی قضاء خانقين فی محافظه دياليیفرض علی الحکومه التعامل معها علی انها ميليشات خارجه عن القانون...»

کوردیەکەی: «سەرۆکی وەزیران نوری مالیکی بە سەرکردەکانی کوردی ڕاگەیاندوە کە بونی پێشمەرگە لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان ئەیانخاتە بەر ڕاونانییاسایی... مالیکی بە سەرکردەکانی کوردی ڕاگەیاندوە بونی هێزەکانی پێشمەرگە لە دەرەوەی هێڵی شین لە قەزای خانەقینی پارێزگای دیالە بە سەر حکومەتی دا ئەسەپێنێ کە وەکو میلیشیاییاساشکێن ڕەفتاریان لە گەڵ بکا...»

کورد هەقێتی لەم دەستەواژانەی لەم چەند مادەیەدا نوسراون سڵ بکاتەوە. بە تۆمەتییاخی بون و هەڵگەڕانەوە... لە قانون بە درێژایی مێژوی حکومەتەکانی عیراق سەدان کورد لە دادگاکانی دا حوکمی ئیعدام دراون و بە هەزاران لە شار و گوندەکان دا کوژراون. ئەگەر بە مەنتیقی مالیکی و هاوکارەکانی بێ، وەکو لە ڕۆژانی قەیرانی خانەقین دا بە ئاشکرا دەرکەوت، پێشمەرگە و هێزەکانی کورد ئەچنە خانەی «المجموعات الخارجه عن القانون» و، بەو دەسەڵاتەی کە هەیەتی وەکو فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عیراق ئەتوانێ داوا لە هێزەکانی ئەمەریکا بکا پێکەوە لە گەڵ هێزەکانی عیراق بچنە سەر هێزەکانی کورد. ئەمە لە کاتێک دا کە هێشتا ناکۆکیە بنەڕەتیەکانی کورد و حکومەتی عیراق بە هەڵواسراوی ماونەتەوە، لەوانە:

یەکەم، ناکۆکی کوردی — عەرەبی لە سەر ناوچە جێناکۆکەکان، کە لایەکی حکومەتی هەرێمی کوردستان و لایەکی حکومەتی عیراقە، لە کاتێک دا هێشتا ناکۆکیەکە یەکلایی نەکراوەتەوە، چۆن ئەبێ هێزەکانی لایەکی ناکۆکیەکە بە «قانونی» و لاکەی تری ناکۆکیەکە بە «المجموعات الخارجه عن القانون» دابنرێ.

دوەم، ناکۆکی کوردی — عەرەبی لە سەر پێشمەرگە و هێزە چەکدارەکانی کورد. دەستوری هەمیشەیی مافی هەرێمی کوردستانی سەلماندوە کە «حرس الاقلیم»ی خۆی هەبێ، بەڵام تا ئیستا جۆری رێکخستنی ئەم هێزە لە گەڵ هێزەکانی حکومەتی ناوەندی لە گفتوگۆدایە. تا ئەمە ساخ نەکرێتەوە چۆن ئەبێ ناتۆرەی «ناقانونی بون» بدرێتە پاڵ لایەک و دەسەڵاتی «قانونی بون» بە لاکەی تر بدرێ.

لە عیراقی ئیستادا ئەو دەزگایە کێیە دەسەڵاتی هەیە لایەک بە قانونی و لایەک بە ناقانونی دابنێ و، دەسەڵاتی هەیە داوا لە هێزەکانی ئەمەریکا بکا بۆ سەرکوتکردنی؟

ئەم رێکەوتنە هێچ جۆرە دڵنیاییەکی نەداوە بە کورد کە مەبەست لە «المجموعات الخارجه عن القانون» پێشمەرگە و هێزەکانی ئاسایش و پۆلیسی کورد نیە. کێ دەستەبەری ئەوە ئەکا حکومەتی عیراق ئەم بیانوانە بەد بە کار نەهێنێ. ئەبو لە سوچی یەکێ لە مادەکانی دا ئەم نیگەرانیەی کوردی برەوانایەتەوە.

## سێیەم: کورد و یەکێتی ئەرزی عیراق

لەم رێکەوتنەکەدا ٣ جار باس لە «یەکێتی ئەرزی عیراق» کراوە، جارێک لە دیباجەکەی دا کە ئامانجی رێککەوتنەکە رون ئەکاتەوە و، نوسیوێتی:

«بۆ... بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەکانی لە سەروەری و ئاسایش و یەکێتی ئەرزی عیراق ئەکرێ...»

هەروەها دو جار لە مادەی ٢٨ دا جارێک لە سەرەتای مادەکەدا کە نوسیوێتی:

«... بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو مەترسیانەی هەڕەشە لە سەروەری و سەربەخۆیی سیاسی و یەکێتی ئەرزی ئەکەن...»

جارێکی تریش لە برگەییەکەمی هەمان مادەدا کە نوسیوێتی:

«... لە کاتی دەرکەوتنی هەر مەترسیەکی... سەروەرییا سەربەخۆیی سیاسی یا یەکێتی ئەرزی یا ئاوی یا ئاسمانی... هەردولا دەسبەجێ دەس ئەکەن بە گفتوگۆی ستراتیجی... بۆ بەرەنگاری ئەو مەترسییانە...»

لەوەتی دەوڵەتی عیراق دامەزراوە هەمو چالاکیەکی کوردی توندوتیژ بوبێیان هێمنانە، سیاسی بوبێیا رۆشنبیرییا کۆمەڵایەتی... ئەگەر داوای دروستکردنی دەوڵەتی کوردی بوبێ،یا داوای ئۆتۆنۆمی،یا تەنانەت داوای هەندێ مافی رۆشنبیری بوبێ، تاوانبار کراوە

به تێکدانی یەکێتی ئەرزی عیراق.

هەر بە بیانوی پاراستنی «یەکێتی ئەرزی عیراق» ەوە حکومەتەکانی عیراق لە سەردەمی حوکمی مەلەکیی بنەماڵەی هاشمیەوە (١٩٢١-١٩٥٨) و دوای ئەو لە سەردەمی حوکمی جمهوری قاسم (١٩٥٨-١٩٦٣) حوکمی عارفەکان (١٩٦٣-١٩٦٨) حوکمی بەعس (١٩٦٨-٢٠٠٣) یەک لە دواییەک جەیشی عیراقیان ناردۆتە سەر کوردستان و دەیان هەزار کوردیان کوشتوە. تەنانەت بۆردومانی کیمیایی هەڵەبجە و ئاواییەکانی تری کوردسان و عەمەلیاتی ئەنفال هەر بەم بەهانەیەوە ئەنجام دراوە.

بۆیە ئەشێ ئەم چەند رستەیەی لەم رێککەوتننامەیەدا سەبارەت بە «یەکێتی ئەرز و ئاو و ئاسمان» و «پاراستنی سەروەری و سەربەخۆیی سیاسی و یەکێتی ئەرزی عیراق» نوسراون، کورد بە هەڕەشەیان بزانێ لە خۆی و بە مەترسی‌یان دابنێ بۆ سەر خۆی. کاربەدەستانی عیراق لە کاتی تەقینەوەی هەندێ ناکۆکی بنەڕەتی دا، کە هێشتا بە زیندویەتی ماون، ئەتوانن دژی کورد، بە کاری بهێنن. ئەگەر نەتوانن لە هەلومەرجی ئیستادا بە لەشکرکێشی جەنگی و هێزی سەربازی تاقی بکەنەوە، ئەتوانن بە رێگەی جەنگی ئابوری و سیاسی جێبەجێی بکەن.

ناکۆکیە کۆنەکانی نێوان کورد و عیراق، کە جاران لە نێوان بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد و حکومەتی عیراق دا بو، ئیستا بۆتە ناکۆکی نێوان کورد و عەرەب، لەوانە:

یەکەم، ناکۆکی عەرەبی — کوردی لە سەر ناسنامەی نەتەوەیی دەوڵەت و ئەرزی عیراق

دوەم، ناکۆکی عەرەبی — کوردی لە سەر سنوری جوگرافی کوردستان

ئەم دو ناکۆکیە هەتا ئیستا یەکلایی نەکراونەتەوە، ئەتوانن هۆی لە یەک ترازان و پێکادان بن. لەو کاتەدا هەڵوێستی ئەم دو لایەنەی رێکەوتنەکە، رۆشنتر هەڵوێستی هێزەکانی ئەمەریکا، لە کورد چی ئەبێ؟ لە گەڵ هێزەکانی عیراق دا پەلاماری کورد ئەدا،یان بێلایەن ئەبێ؟

لە کاتی نوسینی دەستوری هەمیشەیی عیراق دا لایەنی کوردی ویستی مافی چارەی خۆنوسینی کورد لە یەکێ لە برگەکانی دەستوردا بچەسپێنێ، سەرەنجام بەوە کۆتایی هات رستەیەک خرایە ناو دێباجەکەیەوە، کە دوا رستەیەو، ئەڵێ:

«پابەندی بەم دەستورەوە یەکێتی ئازادانەی گەل و ئەرز و سەروەری عیراق ئەپارێزێ»

واتە پاراستنی نەک هەر یەکێتی ئەرزی عراق، بەڵکو پاراستنی یەکێتی گەل و یەکێتی سەروەری دەوڵەتی عیراقیش مەرجدارە. بەستراوە بە پابەندیی بەو دەستورەوە کە

هەندێ لە مافە سەرەتاییەکانی کوردی سەلماندوە. بە واتەیەکی تر ئەگەر کاربەدەستانی عیراق پابەندی دەستور نەبن، کوردیش ناچار نیە پابەندی «یەکێتی ئەرزی عیراق» بێ.

ئەم رێکەوتنە هێچ جۆرە دڵنیاییەکی نەداوە بە کورد کە جارێکی تر حکومەتی عیراق نەتوانێ تواناکانی عیراق (سەربازی، ئابوری، سیاسی...) بە بیانوی پاراستنی یەکێتی ئەرزی عیراقەوە دژی کورد بە کار بهێنێ. ئەبو لە سوچی یەکێ لە مادەکانی دا ئەم نیگەرانیەی کوردی برەوانایەتەوە.

دوای ئەم خوێندنەوەیە پرسیارێ دێتە سەر دەم: جێگەی کورد لەم رێککەوتنە ئەمەریکی – عیراقیەدا چیە؟